# ڕاستییەکی وونبوو!

٧



**توێژینەوەیەکە لەسەر ئامانج وپیلانی ئەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن**




ئامادە کردنی
**فەرمان خەرابەیی**

# ڕاستییەکی ونبوو!

**لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتیە بۆ هەڵسەنگاندنی کاری ئەوانەی لە کوردستان بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن**

نووسینی
**فەرمان عەزیز نەجار خەرابەیی**

١٤٣١.ك    چاپی یەکەم    ٢٠١٠.ز

پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ڕاستییەکی وونبووا

بابەت: کۆمەڵایەتی.

نووسینی: فەرمان خەرابەیی.

چاپ: یەکەم - هەولێر ٢٠١٠.

تیراژ: (١٥٠٠٠) دانە.

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی ( ٢٤٤٦ ) ساڵی ( ٢٠١٠ )ی پێ دراوە

# پێشەکی نووسەر

خوێنەری بەڕێز لەم نامیلکەیەدا پەردە هەڵدەماڵم لەسەر ڕاستیەك کە لە ناو خەڵکی وون بووە و شاراوەیە! ئەویش ئامانج وپیلانی (فێمێنیزمی جەندەری)ە، ئەو کەسانەی بە قسەی زلیان تەنها ئەوانن پاڵەوانی گۆڕەپانی ماف دان بە ئافرەت، وا خۆیان پێشاندەدەن ئەوان تاکە داکۆکی کاری مافی ئافرەتانن، کەچی لە ڕاستیدا ئەوان سەرچاوەی هەموو کێشەیەکن بۆ کۆمەڵگا بە تایبەت بۆ ئافرەتان، ئەوان کاسبیەکەیان لەسەر ئەوەیە قسەی زل بکەن و بازرگانیەکی زیاتریان دەست کەوێت لە ڕێگای قسە ڕازاوەکانیان بۆ ئافرەتان..

بۆ ئەوەی ڕەش وسپی لە یەکتر جیا بکەینەوە.. بۆ ئەوەی ئەو جەندەریانە بە تەواوی بناسین.. هەڵسام بە لێکۆلینەوەیە لەسەر ئامانج وپیلان و کارەکانی ئەو (فێمێنیزمی جەندەری)یانە بە تایبەت جەندەریەکانی کوردستان و پەردەهەڵماڵین لەسەر ڕووخساری شاراوەیان، دوای چەند ساڵێك لە ماندوو بونێکی زۆر بە بەڵگە بۆم دەرکەوت کاری ئەوان تەنها پارە پەیداکردن و بازرگانی کردنە لە ڕێگای ئافرەتانەوە.. گیرفان گەرم کردنی خۆیانە و هیچی تر.. شێواندنی کۆمەڵگا و کێشە نانەوە بۆ ئافرەتان تا زیاتر کاریان دەست کەوێت ئافرەتان ڕوویان تێبکەن.

نووسەر

٢٠١٠/١٠/١

# ئەم کتێبە پێک هاتووە لە دوو بەش

## بەشی یەکەم

باس لە مێژووی ئەو کەسانە دەکات کە بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، واتە: (فێمێنیزمی جەندەری) باس لە قۆناغەکانی دروست بوونیان ئەکات و ئامانج و پیلانەکانیان شیکردنەوەی بەڵگەنامەکانیان.

## بەشی دووەم

باس لەو فێمێنیزمە جەندەریانەی کوردستان دەکات ئەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن چۆن کێشە کۆمەڵایەتیەکان هەمووی لە ژێر سەری ئەوانەوەیە بە بەڵگەوە دەیسەلمێنێ کە ئەوان هۆکاری سەرەکی بوونە بۆ تێکدانی خێزانی کوردی.

# بەشی یەکەم

- بزوتنەوەی فیمێنیزم.
- قۆناغەکانی دروست بوونی فیمێنیزمی جەندەری.
- مەترسی فیکری جەندەر بۆ مرۆڤایەتی.
- زاراوەی جەندەر.
- ئەرك و ماف.

# فێمێنیزمی جەندەری

**بزوتنەوەی فێمێنیزم:**

فێمێنیـزم (feminism) لـە بنەڕەتـدا وشـەیەکی فەرەنـسییە (feminisme) و ریــشە لاتینییەکـەی (femina) یــەوە و بــە مانای ژن ( woman) وەرگیراوە.

شـێوەی پێناسـە کردنـی ئـەم ووشـەیە لـە زمانی ئینگلیـزی (feminine) و لە زمانی فەرەنسیشیدا (feminin)یە.

ئــەوە تەرجەمــەی ووشــەی فێمێنیزمــە، بــەڵام ئەگــەر ئێمــە بمانەوێ لە بزوتنەوەی فێمێنیزم حاڵی بین، دەبێت بگەڕێینـەوە بـۆ مێـژووی دروســت بـوونی فێمێنیـزم.. ئامـانج و کارەکـانی فێمێنیزم.. دروست بوونی بزوتنـەوەی (**فێمێنیزمـی جەنـدەری**) بــە چــەند قۆناغێــك تێپــەر بــووە تــا دروســت بــووە و خــۆی بەهێزکردووە.

# قۆناغەکانی دروست بوونی فێمێنیزمی جەندەری

- فێمێنیزمی لـیبڕاڵ.
- فێمێنیزمی ڕادیکـاڵ.
- فێمێنیزمی جەندەری.

بە گشتی دەتوانین خاڵی سەرهەڵدانی فێمینـزم بگەڕێنینـەوە بۆ سەدەی (١٨)ـە بە تایبەت دوای شۆڕشی گـەورەی فەرەنسا، بـەڵام ئەگـەر وردبینـەوە لـە مێـژووی فێمینـزم دەبیـنین بەسـێ شەپۆل دابەش دەکرێن.

**شە پۆلی یەکەم: فێمێنیزمی لـیبڕاڵ:**

بزوتنـەوەی فێمێنیـزم لـە سـەدەی نۆزدەهـەم بـەباڵی لیبڕاڵـی دەستی پێکرد و داوای چاکسازی کردنی بارودۆخی ئافرەتیان لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و ئابووریـەوە دەکـرد و بانگەشـەی یەکسانیەتی واقعیان کرد، وەك یەکسانی لە دابینکردنـی هـەلی کـارکردن و کرێـی مانگانـە و بـواری خوێندنـدا، فێمێنیزمـی لیبڕالـی گرنگـی تـەواوی بەتایبەتمەندیـەکانی ئافرەت و لایـەنی بایەلۆژی دەدا، باسیان لەچاکسازیکردنی چۆنیەتی کارکردن و

منـــاڵبوون و مۆڵـــەتی دایکایـــەتی و پـــەروەردەکردنی منـــاڵان دەکرد..

ئەوانـــەی کاریگـــەریان هـــەبوو لەســـەر ئـــەو شـــەپۆلە (**مێـــری ولستۆن کرافت**) بەنووسینی کتێبی (**حەقانییەتی مافەکانی ژن**) کاریگەرییـــەکی ســـەرەکی لەســـەر ئـــەو شـــەپۆلە دانـــا، لـــە دوای ناوبراو (**جان ئیستوارت میل**) بە هاوکاریی هاوسەری یەکەمی (**هێـری تیلـور**) کتـێبی (**بەسـتراوەیی ژنـان**) لـە سـاڵی (١٨٦٩) دەنووسێ کە ئەو کتێبەش کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر ئەو شـەپۆلە جـێ هێـشت، دەکـرێ بڵـێین کـە لـە بنەڕەتـدا هـزری لیبڕالیزمی کلاسیك هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئەو شەپۆلە لە قەڵەم دەدرێ.

لـە کۆتـایی ئـەم قۆناغـەدا دەبیـنین فێمێنیزمـی ڕادیکـالەکان سەرهەڵدەدەن و باڵادەستتر دەبن، چونکە دەسەڵاتیان ئەبێ لە ناو دام و دەزگاکان..

## شەپۆلی دووەم: فێمێنیزمی ڕادیکـاڵ:

فێمێنیزمی ڕادیکاڵی لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیسـتەمدا، تــاوەکو کۆتــایی حــەفتاکانی ئەوســەدەیە بــەردەوام بــووە، فێمێنیــستە ڕادیکاڵیــەکان بنــەمای کارەکانیــان لەســەر ئــەو بیرۆکەیە بنیادناوە کە

دەڵێــت: "پەیوەنــدی نێــوان ژن وپیــاو لەســەر هێزێــک دروستبووە کە دەست و بازووی پیاو تێیدا زاڵە"

باڵی ڕادیکاڵی زۆر جەختیان لەسەر جیاوازیەکانی نێوان ژن وپیاو هەروەها پەیوەندی نێوانیان و ئاسەواری ئەو پەیوەندیە لەسەر ئافرەت دەکرد، ئەندامە چالاکەکانی ڕادیکاڵی کۆکبوون لەســەر ئــەوەی کــەوا کێبڕکێیــەکی چــینایەتیو ڕەگــەزی و جەندەری لە نێوان ژن و پیاودا هەیە، پێویستە ئەو چینایەتیە بە تەواوەتی تێك بشکێنرێت.

فێمێنیزمـی ڕادیکـاڵی پیاوانیـان بـە بەرپرسیاری یەکـەمی چەوســاندنەوەی ئافرەتــان دەزانــی و دەڵــێن: هــەموو ئــەو توندوتیژیــە جەســتەییانەی دووچاری ئافرەتــان دەبێتــەوە بــە هۆی هێزی بایەلۆژی پیاوانەوە بووە، ئەمەش ئافرەتی کردوەتـە پاشـکۆ بـۆ پیـاوان، تێـڕوانینی فێمێنیـستەکان بـۆ پەیوەنـدی

نێوان ژن و پیاو بریتیە لە تێڕوانینێکی دژایەتی و ململانێ لە نێوان ئەودوو ڕەگەزەدا، کە لایەنێکیان (واتە ژن) هەموو هێزێکی بەهۆی کۆمەڵگەوە لێسەندراوەتەوە، لایەنی دووەمیان (واتە پیاو) ئەو هێزەی پێدراوە، فێمێنیستیە ڕادیکاڵەکان خێزان و کۆمەڵ بە هۆکاری یەکەمی دواکەوتویی و بێهێزی ئافرەت دەزانن.

ڕادیکاڵیەکان دەڵێن: پێویستە هەندێك چەمکی کۆمەڵایەتی ریشەکێش بکرێت وەك چەمکی (نێرینەوە مێینە)و دەڵێن پێویستە ئەم چەمکە بە تەواوەتی لە ناوبچێت تاوەکو بتوانین زاڵبین بەسەر پۆلێنکردنەوەی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای ڕەگەز، پاش ئەوە چینەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی نوێ دابڕێژێتەوە.

ڕادیکاڵیەکان زۆر گرنگیان بە نەهێشتنی خێزان دەدا، لەلای ئەوان ئەو ووشانە (خۆشەویستی، هاوسەرێتی، پەیوەندی جنسی ژن و پیاو، منداڵبوون، دایکایەتی) کۆمەڵە ووشەیەکی بێزراوە لە فەرهەنگی ئەواندا، بە گشتی ئەم کۆمەڵە چەمکە لە دەرەوە و ناوەوی خێزاندا ڕەتدەکەنەوە، بەم جۆرە تاڕادەیەك پاشەکشێیان لە بەرپرسایەتی خێزان لە دواکەوتویی ئافرەت کردووە، بڕوایان وابوو هەریەکە لەو چەمکانە هۆکارێکی گەورەن بۆ دواکەوتوویی ئافرەت

ئەوانەی کاریگەریان هەبووە لەسەر ئەو شەپۆلە (سیمون دی بوفوار)[1] بە نووسینی کتێبی (ڕەگەزی دووهەم) لە ساڵی (١٩٤٩) و هەروەها (بێتی فریدن) بە نووسینی کتێبی (ژنی هەڵخەڵەتاو) لە ساڵی (١٩٦٣) کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر هاتنە ئارای ئەو شەپۆلە دانا.

(١) خاتوو: سیمون دی بوفوار: نووسەرێکی فەرەنسیە لە ساڵی (١٩٠٨) لە پاریس لە دایك بووە، لە خانەوادەیەکی دەنگین بوونە، باوکی پارێزەربووە، هەموو سەروەتەکەی لە دەست داوە لە جەنگی جیهانی یەکەم، دایکی ئەوو و خوشکەکەی پەروەردەکردووە لەسەر دینی نەصرانی لەسەر بنەماکانی (الکاثولیکیة)، بەرهەمەکانی: روایة المثقفون، الجنس الأخر، المراه بین الحب والزواج، نموذج المرأة الحدیثة، خلق الغموضة.

## شەپۆلی سێیەم: فیمێنیزمی جەندەری:

فیمێنیزمی جەندەری لە ساڵی (١٩٩٠) دەستی پێکرد تا ئێستا، ئەوانەی دەوری باڵایان بینیوە لەم شەپۆلە (میشێل فۆکۆ) و (ژاك دریدا) بوون، جەندەرییەکان بانگەشەی هاوشێوەبوون دەکەن و هەمووجۆرە جیاوازیەك لە نێوان ژن وپیاودا ڕەتدەکەنەوە، بەجۆرێك کە جەنگیان بەرامبەر بە سرووشتی بایلۆژی ئافرەت ڕاگەیاندووە، بڕوایان بە هیچ جۆرە جیاوازیەکی بایلۆژی وکۆمەڵایەتی نێوان ژن و پیاو نیە، بەڵکو دەڵێن: تەنانەت هێزی جەستەیی و بازوویی پیاو بە هۆی پەروەردەی کۆمەڵایەتیەوە دروست بووە، ئەو پێشنیارانەی فیمێنیزمی جەندەری بۆ زاڵبوون بەسەر جیاوازیەکانی نێوان ژن وپیاو هێنایانە کایەوە، بریتیە لە دووبارە دابەشکردنەوەی ڕۆڵ لە ڕووی کۆمەڵایەتی و کلتووری و سیاسیەوە لە نێوان ژن و پیاودا.

لە تاوتوێکردنی ستراتیژی جەندەریەکاندا ئەوە بەدیدەکرێت کە پیاو وەك ستاندەرێك بۆ کاری ئافرەتان دانراوە، واتە ژنان ڕۆڵی پیاو ببینن یان بە مانایەکی تر بە تەواوی ببن بە پیاو، کەواتە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵی مێینە نامێنێت، هەمووکارەکانی مێینە بەکەم دەزانرێت، لەبەرامبەر ئەمەشدا

هیچ گۆڕانکارییەك لە ڕۆڵی پیاودا نابینرێت، دەرئەنجامیش ئەوەیە ژن ببێتە پیاو، پێویستە قوربانی بە هەموو تایبەندمەندییەکانی خۆی بدات و لایەنی سۆزداری و جنسی بەتەواوی فەرامۆش بکات.

# مەترسی فیکرەی جەندەر بۆ مرۆڤایەتی

فیکری جەندەر مەترسیەکی زۆر گەورەیە بۆ سڕینەوەی یاسای مرۆڤایەتی لەسەر ڕووی زەوی!! جەندەر مەترسیەکی زۆر سامناکی لە ناو خۆی حەشارداوە!! بۆیە دەبێت هەموو لایەکمان لە مانا و ئامانجەکانی فیکری جەندەر ئاگادار بین!!

ئەو کەسانەی ئێستا بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکەن و ئەو سەنتەر و ڕێکخراوانەی ئێستا دامەزراون بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەتان هەموویان لە قۆناغی کۆتایی فێمێنیزمی جەندەری دانە، واتە: جەندەرین و داوای یەکسانی جەندەری دەکەن.. کەواتە با بزانین جەندەری چیە!!

تێبینی: ئەو سەنتەر و ڕێکخراوانەی لە کوردستان هەن فیکرە و ئامانجی فێمێنیزمی جەندەریان هەیە، هەموو هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ ئەوەیە فیکرەی جەندەری لە ناو ئافرەتان و کۆمەڵگای کوردستان بڵاوبکەنەوە.

## زاراوەی جەندەر:

جەندەر (Gender) ووشەیەکی ئینگلیزیە و لە ئەسڵدا لاتینی یە و بەمانای (جۆری کۆمەڵایەتی) دێت، هەوڵ دەدرێت لە جیاتی هەدوو ووشەی (نێرو مێ) جەندەر بەکاربهێنرێت، ووشەی جەندەر بۆ یەکەمجار لە بەڵگەنامەی کۆنگرەی دانیشتوانی قاهیرە هاتووە لە ساڵی (١٩٩٤) ئەو ووشەیە لە (٥١) شوێنی بەڵگەنامەکە هاتبوو، لە بەڵگەنامەی کۆنگرەی جیهانی پەکینیش ساڵی (١٩٩٥) ئەو ووشەیە لە (٢٣٣) شوێنی بەڵگەنامەکە هاتبوو، ماناکەشی بە ئەنقەست ڕوون نەکرابوویەوە..

بەڵام توێژەرەوانی بواری کۆمەڵناسی ڕوونی دەکەنەوە کە مەبەست لە جەندەر ئەوەیە کە جیاوازیە بایەلۆژیەکانیش چ جای جیاوازی تر لە نێوان (نێرو مێ)دا نەهێڵێت و بگاتە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ مەرج نیە هەتا سەر(مێ) بێت یان (نێر) بەڵکو دەتوانێ ڕەگەزی خۆی بگۆڕێت..

جەندەریەکان بۆیە ووشەی جەندەر بەکار دەهێنن، تاکو ووشەی (نێر و مێ) لە هەموو فەرهەنگی مرۆڤایەتی بسڕنەوە، ئەگەر ئەو پیلانەیان سەربگرێ ئەو کاتی یاسای سەرزەوی

هەمووی تێك دەچێ.. چونکە ئەگەر (نێر، مێ) نەما ئەوکاتی جەندەر دێتە شوێنی (نێر، مێ) و ڕەگەز نامێنێ ئیتر مەرج نیە هەر ژن دایك بێت یان خێزان، بەڵکو پیاویش دەبێت ببێت بە دایك ومندالی ببێ، خێزان مەرج نیە هەر بمێنێ و ئەگەر مایەوەش مەرج نیە بە (زواج) بێت و مەرجیش نیە تەنها (ژن و پیاو) بە یەکەوە پێیان بگوترێت خێزان بەڵکو (ژن و ژن) یان (پیاو و پیاو ) یش پێی دەگوترێ خێزان...

ئیتر شەرعیەت دان بە نێربازان و هاوڕەگەزەکان و گەڕانەوەی سیستەمی (منالی تەبەننی) هەروەها دروست کردنی گیانی ڕکابەری و دژایەتی لە نێوان هەردوو ڕەگەزی (نێر و مێ) لە جیاتی خۆشەویستی و سۆز ، هەروەها مانای جەندەر سەردەکێشێ بۆ نەهێشتنی ڕۆڵی باوك لە خێزان و بگرە هەڵوەشانەوەی یەکەی خێزان و بانگەشەکردن بۆ ئەوەی ژن خاوەنی جەستەی خۆیەتی چۆنی پێ باشە وای بەکاردێنێت کە ئەمەش هاندانی بەڕەڵایی یە (الإباحیة) و شەرعیەت دانە بە منالْ لەبار بردن و... هەروەها جەندەریەکان گومان دەخەنە سەر دین و لە دلی ژنان و کچان وا نیشان دەدرێت کە ئایین ڕێگرە لە یەکسانی و ئازادی و باس لە مەسەلەکانی (قوامە و میرات و شایەدی و فرەژنی و حیجاب و... هتد) دەکرێت.

# ئەرك و ماف

هـەموو یاسـاکانی دونیـا دامـەزراوە لەسـەر (ئـەرك و مـاف) ئەگـەر دەسـت بـە یـەکێکیان بگـرین و یەکێکیـشیان بـەردەین، ئەوکات ژیان تێك دەچێ..

بـۆ نموونـە: فەرمانبـەرێك لـە کۆمپانیایـەك دامـەزراوە (ئـەرك و مـاف)ی خـۆی هەیـە، کاتێـك دامـەزراوە پێیـان ڕاگەیانـدووە کـە ئەرکی تۆ دەوام کردنە لە کاتژمێر (٩)ی بەیانی تا (٣)ی ئێوارە، ئەگەر ئەرکی خۆت بە جێهێنـا، ئەوکاتی مافی خۆت پێدەدەین کە (٣٠٠) دۆلارە.

هەموو شتێك لەم دونیایە (ئەرك و ماف)ی خۆی هەیـە، بـەڵام جەندەریەکان چونکە ئامانجیان تێکدانی یاساکانی ژیانـە، بۆیـە هەرگیز باسی ئەرکی ئافرەت ناکەن..

بیر بکەوە و لە مەودوا بڕوانە بزانە هەرگیز گوێت لەو کەسانە بووە کە بە نـاو داکۆکی لـە مـافی ئافرەت دەکـەن باسـی ئـەرکی ئافرەت بکەن.

ئەوانـە چـەندین ئامـانجی زۆر ترسـناکیان هەیـە کـە هـەوڵی چەسپاندنی ئەدەن..

# کۆنگرە جیهانیەکانی باسی مافی ئافرەتی تیا کراوە

⌘ کۆنگرەی جیهانی یەکەمی دانیشتوان، لە (بوخارست . رومانیا) بەسترا، لە ساڵی (١٣٩٤هـ.١٩٧٤م).

⌘ کۆنگرەی جیهانی بۆ ئافرەتان، لە (مکسیکو) لە ساڵی (١٣٩٥هـ/١٩٧٥م) بەسترا.

⌘ کۆنگرەی جیهانی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ئافرەتان، لە (کوبنهاجن) بەسترا، لە ساڵی (١٤٠٠هـ.١٩٨٠م)

⌘ کۆنگرەی دەولی دانیشتوان، لە (مکسیکو) بەسترا، لە ساڵی (١٤٠٤هـ.١٩٨٤م).

⌘ دەورەی دژی توندوتیژی ئافرەت، لە (نیویورک) بەسترا، لە ساڵی (١٤٠٤هـ.١٩٨٤م).

⌘ کۆنگرەی جیهانی (استعراض وتقييم عقد الأمم المتحدة للمرأة) لە (بنیروبی) بەسترا، لە ساڵی (١٤٠٥هـ.١٩٨٥م).

⌘ کۆنگرەی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ژینگە و گەشەپێدان لە (ریودی جانیرو) بەسترا، لە ساڵی (١٤١٢هـ.١٩٩٢م).

⌘ کۆنگرەی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ مافی مرۆڤ لە (فیینا) بەسترا، لە ساڵی (١٤١٣هـ-١٩٩٣م).

⌘ کۆنگرەی دەولی دانیشتوان و گەشەپێدان، لە (القاهرە) بەسترا، لە ساڵی (١٤١٥هـ-١٩٩٤م).

⌘ کۆنگرەی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی، لە (کوبنهاجن) بەسترا، لە ساڵی (١٤١٥هـ.١٩٩٥م).

⌘ کۆنگرەی چوارەمی دەولی تایبەت بە ئافرەتان، لە (بکین) بەسترا، لە ساڵی (١٤١٦هـ.١٩٩٥م).

# ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم بەشە سوودم لێ بینیوە

- (کورتە مێژوویەکی فێمێنیزم و چەند لایەنێکی) و: شنۆ مێهرپەروەر.
- ژنان و بزوتنەوەی فیمینیستی. کەژاڵ عەلا.
- شەپۆلەکانی فێمێنیزم. باران ڕۆژهەڵات.
- قۆناغەکانی فێمێنیزم. فەریا.
- (جەندەر، وەك مۆدێلێکی نوێی فیمینیزم) هەتاو مەحەمەد صالح.
- ئایا حکومەتی هەرێم بیری لەو دروشمە کردۆتەوە ؟ ((بەڵێ بۆ یەکسانی جەندەری نا بۆ تووند و تیژی)) پارێزەر زانا ڕۆستایی.
- اتفاقية "سيداو" في منظور الشريعة الإسلامية. د. تيسير الفتياني.
- (الجندر) .. المفهوم والغاية!! د.نورة السعد.
- الجنـــدر ... المنشأ - المدلول – الأثر. د. مثنى أمين نادر و كاميليا حلمي محمد.
- الجندر بين المصطلح والنظرية. د. عالية فرج الكوردي.
- الجندر ـ مفهومه ـ أهدافه. د. حسن بن محمد علي شبالة.
- الفيمينزم .. الأبعاد المعرفية والدلالات الاجتماعية. عصام زيدان.
- (النوع الاجتماعي) الجندر . سيما عدنان أبو رموز.
- الفيمنيزم" من المساواة إلى التماثل! د.عالية فرج الكوردي.
- مفهوم " الجندر " ودوره في نشاط المنظمات الدولية. محمد شريح.

# بەشی دووەم

- ڕاپرسی: ڕێکخراوو و سەنتەرەکانی ژنان و ئافرەتان تا چەند خزمەتیان بە کۆمەڵگای کوردی کردووە؟!

## ئامانج و پیلانەکانیان

- کۆمەڵگایەکی بۆگەن و دواکەوتوو.
- وێران کردنی کۆمەڵگا بە بیر و بۆچوونە شازەکانیان.
- بێڕێزی بەرانبەر باوك ودایك و کەسی گەورە.
- ڕێخۆشکردن و هاندان بۆ تەڵاق.
- سەرهەڵدانی قەیرەیی.
- ڕێخۆشکردن و هاندان بۆ کاری بەدڕەوشتی و لەشفرۆشی.
- بەرپاکردنی دژایەتی لە نێوان (نێر ومێ).
- ڕێخۆشکردن بۆ سووتان و ژن کوژی.
- پێشێل کردنی مافی ئافرەت و چەوسانەوەی.
- دژایەتی کردنی ئیسلام.
- دژایەتی کردنی مامۆستایانی ئاینی.

## ڕێکخراو و سەنتەرەکانی ژنان و ئافرەتان تا چەند خزمەتیان بە کۆمەڵگای کوردی کردووە؟!

یەکێتی ژنان لە سایتەکەی خۆیان بە ناوی (ژیانەوە) ڕاپرسییەکیان ئەنجام دابوو ڕاپرسییەکەش بەم شێوە بوو:

**دوای هەژدە ساڵ کارکردن، ئایا یەکێتی ژنانی کوردستان توانیویەتی ببێتە داکۆکیکاری مەسەلەکانی ژنان: ئە نجامی ڕاپرسییەکە بەم شێوەبوو:**

- ✓ **بەڵێ: (% ١٩,٨٢) : (٢٢) دەنگ.**
- ✓ **نەخێر: (% ٨٠,١٨) : (٨٩) دەنگ.**

**کۆی هەموو دەنگەکان (١١١)دەنگ**

ئەمە لە سایتی خۆیان ئەنجامیان داوە، دڵنیاشم ئەو (٢٢) دەنگەش تەنها ئەو کەسانەن کە سایتەکە بەڕێوە ئەبەن[٢].

---

(٢) سایتی ژیانەوە.

## ڕا پۆرتی وادی ئەڵمانی لەسەر ڕێکخراوەکانی ژنان:

هاریکاری یاسایی ژنان، بە هاوکاری ڕێکخراوی "وادی" ئەڵمانی، ڕاپۆرتێکی لەبارەی ئاستی خزمەتگوزاریی و شەفافیەت لەسەنتەر و خانەکانی داڵدەدانی ژنان بڵاوکردەوە، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەش لەبەشێك لە سەنتەرەکانی داڵدەدانی ژنان، مامەڵەی ناتەندروست بەرامبەر بەو ژنانە ئەنجامدەدریت کە لەو سەنتەرانەدا داڵدەدراون.

سوعاد ئەورەحمان، ڕێکخەری پرۆژەکانی ژنان لەڕێکخراوی "وادی" ئەڵمانی، بە"کوردهەواڵ" ی ڕاگەیاند: بەشێك لەسەنتەرەکانی تایبەت بەداڵدەدانی ژنان بەشێوەیەکی نادروست مامەڵە لەگەڵ ئەو ژنانە دەکەن کە لەلایان داڵدەدراون، ئامانجیش لەبڵاوکردنەوەی ئەو ڕاپۆرتە دابین کردنی ژیانێکی باشترە بۆ ئەو ژنانە، چونکە ئەوانە لەدەست توندوتیژی هەڵاتوون و ناکرێت بەشێوەیکی ناتەندروست مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت .

ڕێکخەری پرۆژەکانی ژنان لە ڕێکخراوی "وادی" ئەڵمانی، ئاشکراشی کرد: هەندێك لەو سەنتەرانە ڕێگریان لەئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتە کردووە بەوەی کەنەیان هێشتووە زانیاری لەو ژنانە وەربگیرێت کە لەلایان ژیان بەسەردەبەن[٢].

---

(٢) سایتی http://www.kurdhawal.com

## زۆرینەی خەڵك بڕوایان بە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان نیە:

بە گوێرەی ڕاپرسییەکی ڕێکخراوی (ڕۆژهەلاّت) کە لە هەر سێ شاری (هەولێر،دهۆك، سلیمانی) ئەنجامدراوە، زۆرینەی خەڵکی بڕوایان وایە کە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان ڕۆلی لاوازیان هەبووە لە بەرەو پێش بردنی ڕەوشی ئافرەتان لە کوردستان:

**ڕا پرسی: ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی ژنان وئافرەتانت پێ چۆنە بۆ باشکردنی ڕەوشی ئافرەتان لە کوردستان؟!**

**ئە نجامی ڕا پرسییەکە بەم شێوەیە بوو**

**ڕۆلی لاوازیان بینیوە: ( % ٤٢,٢٦)**

**هیچ ڕۆڵیان نەبینیوە: ( % ٣٧,٢٦)**

**ڕۆڵی باشیان بینیوە: ( % ١٦,٤٦)[٤].**

---

(٤) ڕۆژنامەی بارزان (ژ:٥٩/ ل: ١) ساڵی ٢٠٠٨/٣/١٦.

## ڕێکخراوەکانی ژنان وئافرەتان و بێمتمانەیی هاوڕەگەزەکانیان:

ئەوە ناونیشانی ئەو بە دواداچوونەیە کە ڕۆژنامەی هاولاتی ئەنجامی دابوو، لەم بە دواداچوونەدا ڕای چەندین ئافرەت وەردەگرن لەسەر ئەو ڕێکخراوانە، زۆربەیان دەلێن:

ڕێکخراوەکانی ژنان وئافرەتان هیچ خزمەتیان بە ئافرەتان نەگەیاندووە، تەنها بۆ پڕکردنی گیرفانی خۆیان هەوڵدەدەن و بەرژەوەندی مادی خۆیان پێش هەموو شتێك دەخەن. یەکێك لەو هاولاتیانە کە شنۆ ئەنوەری (٣٥)ساڵە دەلێت: کاری سەرەکی زۆربەی ڕێکخراوەکانی ژنان بوەتە کردنەوەی خولی مۆسیقا و بەرگدووری و لەشجوانی، تەنانەت بەرانبەر بەوانەش پارەیەکی زۆر لە ژنان وەردەگرن، بۆیە پێویستە چیتر تەنها کار بۆ دەسکەوتی پارە نەکەن، چونکە کاری ئەوان خزمەت کردنە نەك بازرگانی.

سروە کەمال زۆر بە نیگەرانیەوە لە کاری ڕێکخراوەکانی ژنان دەدوا کە بە ناوی بەرگری کردن لە مافەکانی ژنان دامەزراون، ئەو لە بارەی کێشەکەی خۆیەوە باسی لەوە کرد کە چەند جارێك سەردانی یەکێك لە دیارترین ئەو ڕێکخراوە ژنانەی کردووە، کە لە هەموو کۆبونەوەیەکدا سنگی خۆیان دەردەپەڕێنن و دەڵێن ئێمە بەرگری لە مافی ئافرەت دەکەین... -کەچی- ئەوانیش گاڵتەیان پێکردووە کە تووشی کێشەیەکی لەو شێوە بووە[٥].

---

(٥) ڕۆژنامەی هاولاتی (ژ:٣٩١/ ل: ٧) ساڵی ٢٠٠٨/١/٢٧.

## ڕاپۆرتێکی تر لەسەر ڕێکخراوەکانی ئافرەتان:

لە راپۆرتێکی سایتی ڕێگای کوردستان پرسیار دەکات لە ئافرەتان لە بارەی ڕێکخراوەکانی ژنان:

(کوردستان حەمید) قوتابی زانکۆ تەمەن (٢٦) ساڵ وتی "قوتابی زانکۆم بەشی خۆم لەژیان تێگەیشتووم و کۆمەڵگام بینیوە، توانیومە بە پێی توانای خۆم هەوڵبدەم بۆ هەندێ شت دەربارەی ئافرەتان"، یەکێك لەو کارانەی کە زۆر بە داخەوە کچان و ژنان تووڕە دەکات بێ متمانەییان بەرامبەر بە ڕیکخراوەکانی ئافرەتانە، (کوردستان) لە درێژەی قسەکانیدا ئامارەی بەوەدا ئەو بێ متمانەییە وای لە کچان کردووە کە لە خۆیان بێزاربن ، چونکە تۆ دەبینی ئەمرۆ دەیان ڕێکخراو هەیە خزمەت بە لاوان و قوتابیان و مامۆستایان و پیشەوەران و هتد..، بەڵام بە داخەوە ئەو ڕێکخروانەی کە بۆ ئێمەی ئافرەت کار دەکەن نازانین لە کوێن چونکە ئەو ڕێکخراوانە تا ئێستا نەهاتوون چەند ئافرەتێك لە جێگایەك کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە نرخ ومانای خۆی بزانێت بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە هەست بە بوونی خۆی بکات کە ڕێکخراوێك هەیە داکۆکی لە سەر دەکات بۆیە دوای تێڕوانینم بۆ کۆی ئەم قسانەم پێموایە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان جگە لە کارکرنی ژێرا و ژێر بۆ حزبەکانیان هیچ کارێك بۆ ژنان ناکەن.

(فاتمە مەجید)ی تەمەن (٣٦) ساڵ کە ژنیماڵەوەیە و دانیشتووی ناحیەی ڕزگارییە وتی کەوا ڕێکخراوەکانی ژنان تائێستا نەهاتوون سەردانی ماڵان بکەن و خۆیان بەو ژنانە بناسێنن کە لەماڵەوەن و نایەنە دەرەوە و خەریکی کاروباری ماڵن، فاتمە لە درێژەی قسەکانیدا ئەوەی وت "من چۆن ئەو ڕێکخراوانە بە خاوەنی خۆم بزانم کە تا ئێستا نەمان بینیون و نازانم چیان هەیە بۆ ئێمەی ژنان بۆ خزمەتکردنمان، گەر لە خۆمەوە بڕیار بدەم کە ئەو ڕێکخراوانە چی دەکەن و کاریان چییە.

(شۆخان مەحمود) کە قوتابییە لە خوێندنی خێرا و دانیشتووی ناحیەی ڕزگارییە پێی وایە ئەمڕۆ لە کوردستان هەر ڕێکخراوێك بوونی هەبێ یا تازە دامەزرابێ، جگە لەو کەسانەی کە لە دەوری خۆیان کاردەکەن، کار بۆ هیچ ژنێکی تر ناکەن، ئەگەر بشیکەن ڕەنگە باش خزمەت نەکات، بۆیە من پێم وایە ڕاستە ئێمەی ژنان تاڕادەیەك کەم تەرخەمین، بەڵام ئەو ڕێکخراوانە کار و چالاکییەکانیان لە چوارچێوەی دیواری بارەگای ڕێکخراوەکەیان نایەتە دەرەوە تا ئێمەیش سوودمەند بین لەو چالاکییانە[٦].

(٦) سایتی ڕێگای کوردستان.

# ئامانج و پیلانەکانیان

## کۆمەڵگایەکی بۆگەن و دواکەوتوو

ئەم وێنەی خوارەوە لە ساڵنامەی (٨مارس) بڵاوکراوەتەوە، کە یەکێتی ژنانی کوردستان دەریدەکات، لەم وێنەیە دوو دەست کراوە، دەستێکیان لەسەری نووسراوە(**کۆمەڵگا**) وپەتێکی لە ملی ئافرەتێك کردووە بۆ ئەوەی لە سێدارەی بدا، دەستەکەی تریش لەسەری نووسراوە (**کلتوور**) کورسیەکەی بن پێی ئافرەتەکە دەردێنێ بۆ ئەوەی بیکوژێ.



(٧)

(٧) ٨ مارس ژمارەی (١١)ی ساڵی ٢٠١٠/٣/٨.

ئەو نووسەر و ڕێکخراو و سەنتەرانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکەن دەڵێن: کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی بۆگەن و دواکەوتوو و خێڵەکیە و قورگی ئافرەتی گرتووە دەیەوێ بیخنکێنێ... ئەوە قسەیەکی زۆر دوورە لە ڕاستی، کۆمەڵگای کوردی خاوەنی داب ونەریت وبەهای زۆر بەرزە، کۆمەڵگای کوردی ڕێزێکی تایبەتی بۆ ئافرەتان داناوە، لە کۆمەڵگای کوردی ئافرەت هەر چەند بە تەمەن بێ زیاتر ڕێزی دەگیرێ بە پێچەوانەی ئەو داب و نەریتە ئەورووپیەی ئەوان بۆمانیان هێناوە کە ئافرەت تەنها ئەگەر جەستەی گەنج بوو ڕێزی بگیرێ چونکە کاریان پێیەتی، کاتێکیش پیر دەبێ کەس نابێتە خاوەنی.

ئەوە ئەو نووسەر و ڕێکخراو وسەنتەرانەن بە ناوی داکۆکی کردن لە مافی ئافرەت بەها و ڕێزی ئافرەتیان نەهێشتووە، چونکە داب ونەریت وبەها بەرزەکانی کۆمەڵگای کوردی بە بۆگەن ئەزانن، ئەچن داب و نەریتی ئەورووپیمان بۆ دێنن کە تاکی ئەورووپا حەسوودی بە ئەخلاقی جوانی کوردی ئەبەن.

من لێرەدا لە هەموو کەسێکی بە ویژدان و لە خۆشیان دەپرسم.. ئایا پێش ئەوەی ئەو نووسەر و ڕێکخراو وسەنتەرانە سەرهەڵیدەن بە ناوی داکۆکی کردن لە مافی ئافرەت.. داب ونەریتی کوردی بشێوێنن و داب و نەریتی ئەوروپیمان بۆ بێنن، ئایا ئافرەت ئاوا تووشی نەهامەتی هاتبوو؟

- ✓ ئایا ڕێژەی تەلاق وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...
- ✓ ئایا ڕێژەی سووتان وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...
- ✓ ئایا ڕێژەی قەیرەیی وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...
- ✓ ئایا ڕێژەی لێدانی ئافرەت وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...
- ✓ ئایا ڕێژەی هەلاتنی ئافرەت وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...
- ✓ ئایا ڕێژەی تێك چوونی خێزان وەك ئێستا وابوو؟! وەلام...

بۆچی پێش ئەوەی ئەوان بێن ئەو حاڵەتانە نەبوو.. ئەگەر هەشبووبێ زۆر بە کەمی بوو؟ بەلام لەگەڵ هاتنی ئەوان ئەو حاڵەتانە بەو ڕێژە ترسناکە بەرز بۆوە؟

# وێران کردنی کۆمەڵگا بە بیر و بۆچوونە شازەکانیان

## ❖ مارەبرینی ژن لە ژن و پیاو لە پیاو:

**خاتوو ڕێکپۆش عەزیز:** پێی وایە مارەبرینی ژن وپیاو لە یەکتر دکتاتۆریە و ستەمە، بەڵکو پێشکەوتن ئەوەیە ژن و ژن لە یەک مارە بکرێن و پیاو وپیاویش لە یەک، کە دەڵێت:

"مەسەلەی سێکس پەیوەندیەکی مرۆییە و مەرج نیە لە نێوان (ژن و پیاوێک)دا بێ، ئەمرۆ پەیوەندیە سێکسیەکانی نێوان (ژن و ژن) یان (پیاو و پیاو) هێندەی مەسەلەی هێترۆ سێکسوالیتت گرنگە، وە یا ڕەنگە بۆ هەندێ کەس مەسەلەی سێکس تەنها لە ڕێی (عادەی سریەوە) بە ئۆرگاسم بگات، ڕەنگە ئەمە ڕاستییەکی ڕەهای کۆمەڵگەی ئێمە بێ کە مەسەلەی سێکس تەنها بە ژنێک و پیاوێکەوە دەبەستن. کە ئەمە هێترۆنۆرماتی پێ دەڵێن مانای هەموو مرۆڤەکانی کۆمەڵگە بە زۆر و ئیجباری پەیوەندیە سێکسیەکانیان دەبێ لە نێوان ژن و پیاوێکدا بێت کە لە ڕاستیدا ئەمە ڕوانگەیەکی دیکاتۆریانەیە لە مەسەلەی سێکسدا"[٨].

---

(٨) http://www.emrro.com/rekposheziz.htm

❖ بۆ پیاوان دوو ژنیان هەبێ و ژنان دوو مێردیان نەبێ:

خاتوو هاوژین حەمە رەشید: گلەی دەکا بۆ ڕێدەگیری لەوەی ژن دوو پیاوی هەبێ دەڵێت:
"بۆ پیاوان دوو ژنیان هەبێ و ژنان دوو مێردیان نەبێ سەرکۆنەت دەکەن و دەڵێن بەدڕەوشتییە، لە کاتێکدا بۆ پیاوانیش هەمان شتە، بۆچی بۆ پیاوان بەدڕەوشتی نییە خۆ ئەوەش لە سایەی زانستدا بەسەرچوو کە بگوترێ منداڵەکان نازانرێ هی چ پیاوێکن، چونکە ژنان تەنیا لەم ڕێگەیەوە دەتوانن بەر لەم پرۆسە نا ئینسانییە بگرن"[٩].

---

(٩) سایتی: www.rudaw.net، ناونیشانی بابەت: فیمینیستەکانی نێمە و سێکسی بە کۆمەڵ.

## بێ ڕێزی بەرانبەر باوك ودایك و کەسی گەورە

وایان لە ئافرەتان گەیاندووە ئەگەر باوکت یان برات ئامۆژگاری کردی قبوڵی مەکە چونکە ئەمە پیاوسالارییە، تۆش مرۆڤی وەکو ئەو چۆن قبوڵ ئەکەی ئامۆژگاریت بکا!! ئەگەر وای کرد پەیوندیمان پێوە بکە تا بە گرتنی بدەین.

لە ڕادیۆی نەورۆز گوێم لێبوو کوڕێك دەیگووت: برادەرێکم سکاڵای لە لام دەکرد دەیگووت:

خوشکەکەم کاتێ چوە قۆناغی ناوەندی، من بۆ خۆم هەموو ڕۆژێك دەمبرد بۆ قوتابخانە، تا وای لێهات ڕۆژێکیان پێم گووت: ئێستا متمانەم پێت هەیە ئازادی بەتەنها بچۆ بۆ قوتابخانە.. ئەوەبوو ماوەیەك بەم شێوە بە تەنها دەڕۆیی، تا ئەوەی چەند برادەرێکم پێیان ڕاگەیاندم کە خوشکەکەمیان بینیوە چەندین جار لەگەڵ چەند کوڕێك بەسەیارە ڕۆیشتووە، منیش بۆ ئەوەی دڵنیابم لە قسەکانیان، ڕۆژێکیان چووم لەبەر دەرگای قوتابخانەکەیان خۆم حەشاردا تا بزانم چی دەکات، بینیم هاتەدەروە بەرە و سەیارەیەك ڕۆی کە سێ کوری تیا بوو سواربوو ڕۆیشتن، منیش بەدوایاندا ڕۆیشتم تا چونە ئەو شوێنەی مەبەستیان بوو، جا کاتێ خوشکەکەم هاتەوە، پێم

گووت: ئەوانە کێبوون لەگەڵیان چووی، پێی گووتم: وس قسە نەکەی.. هەر قسە بکەی خۆم دەسووتێنم، ئەوکات شکاتت لێ دەکەم دەتگرن[١٠].

گەنجێك هاتە لام بە کوڵ ئەگریا دیاربوو تووشی کێشەیەکی زۆر گەورە ببوو.. لێم پرسی برام چ کێشەیەکت هەیە؟
ووتـی: مامۆسـتا خوشـکێکم هەیـە مـاڵی لێمـان کردۆتـە دۆزەخ.. بـە ئاشـکرا و لەبەر چاوی ئێمـە لەگـەڵ کوری خـەڵکی کات ئەکوژێ، کە ئامۆژگاریشی ئەکەین دەچێ شکاتمان لێ ئەکا و ئەڵێ مافم پێشێل ئەکەن.. بۆیە نازانین چی بکەین.

بەڵێ: بەرێزان ئەوە کاری ئەوانە، رێز نەگرتنی دایك و باوك و کەسانی گـەورە.. ئەیانـەوێ کاتێـك بـاوك یـان دایـك ئامۆژگـاری کـچەکەی بکا کـچەکەی، یەك راسـت لـە مـاڵ هـەڵێت و بـچێت بـۆ لای ئەوان، ئەوانیش بە هەوەسی خۆیان ئیستغلالی بکەن.

---

(١٠) رادیۆی نەورۆز بەرواری (٢٠٠٨/٣/٨) کاتژمێر (٠٣:٤٩)ی ئێوارە.

# ڕێخۆشکردن و هاندان بۆ تەڵاق

ڕێـژەی تـەڵاق لـە عێـراق سـاڵی پـار[11] گەیـشتە (٨٥٪) لـە (٨٢٠) هەزار حاڵەتی زەواج (٤٥٣) هەزار حاڵەتی تەڵاق بووە..

پارێزەر (طارق حرب) دەڵێت: هۆکاری ئەو ڕێژە زۆرەی تـەڵاق ڕێکخراوە مەدەنیەکانن (واتە: ڕێکخراوەکانی ژنان وئافرەتان)..

ئـەو ڕێکخراوانـە ئافرەتـان هانـدەدەن بیرکردنەوەیـەکی ئەوروپییانە بیربکەنەوە.. بە جۆرێك ئافرەتانیان وا تێگەیاندووە کە پیـاو هـەر قسەیەك ئاراستەی خێزانەکـەی بکـات ئـەوان بـە پیاوسـالاری و بـێ ڕێـزی ئـەزانن بەرانبـەر ئـافرەت.. ئـەو ڕێکخراوانە لە بری ئەوەی تەڵاق لای خێزانەکان شیرین بکەن بۆ نایەن خۆشەویستی لە ناو خێزانەکان بڕوێنن[12]!!

لە پرسیارێکی ڕۆژنامەی هاوڵاتی کە ئاڕاستەی خـاتوو خـانم رحیمی دەکات، بەڕێوەبەری ڕێکخـراوی ئاسـوودە: سـەبارەت بـە زیـادبوونی ڕێـژەی تـەڵاق، پێـت وانیـە ژنـانیش بـەژداربن لـە ناکۆکیەکان؟

---

(١١) (٢٠٠٩)

(١٢) http://www.aljewar.org/news-٢٤٧٥٠.aspx

**خاتوو خانم رحیم دەڵێت:** من وای نابینم، ئەتوانم بڵێم بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەیوندی بەوەوە هەیە کە ژنان هۆشیاربوونەتەوە، چیتر ژێر دەستەیی قبوڵ ناکەن، تەنانەت زیادبوونی کوشتنی ژنانیش هەر ئەوەیە کە کچێك قبوڵی ناکات بە زۆر بەشوو بدرێت بە کەسێك کە خۆی خواستی لەسەر نەبێ، یان شتی تر، دێت پەنا دەبات بۆ سەنتەر و ڕێکخراوەکانی ژنان، بەڵکو من ئەوە بە پۆزەتیف ئەزانم، کە -تەڵاق- زیادی کردووە(١٣).

ئەوان هۆکارێکن بۆ زیاد بوونی تەڵاق، چونکە ئافرەتانیان وا تێگەیاندووە کە ئەگەر پیاوەکەی ئامۆژگاری کرد ئەوە پیاو سالارییە و نابێ، بۆیە وەرە لای ئێمە و شکاتی لێ بکە.. کاتێکیش ئەو ئافرەتە شکات لە پیاوەکەی ئەکا، پیاوەکە بە سوکایەتی ئەزانێ و دڵی لەسەر خێزانەکەی سارد ئەبێ و تووشی تەڵاق ئەبن.. لێرەدا کێ هۆکار بوو بۆ ڕوودانی ئەم تەڵاقە؟!

کاتی خۆی ئەگەر ئافرەتێك کێشەی لەگەڵ پیاوەکەی هەبایە، چەند کەسێکی بە تەمەنی دنیا دیتە ئەچوون کێشەکەیان چاك ئەکرد و ژن وپیاوەکەیان ئاشت ئەکردەوە.. بەڵام ئێستا ئەگەر

---

(١٣) ڕۆژنامـــەی هاوڵاتی (ژ:٣٩٩/ ل: ١٥) ساڵی ٢٠٠٨/٢/٢٤.

ژن و پیاوێک کێشەیەکیان هەبێ، ڕێکخراو و سەنتەرەکان و بەناو داکۆکی کارانی مافی ئافرەت، وا ئەکەن کێشەکە زیاتر قوڵ دەکەنەوە، تا بە تەڵاق کۆتای پێ دەهێنن..

دە (١٠) حاڵەتی تەڵاق کە پیاوەکان هاتونەتە لام گوتوویانە خێزانی خۆمان تەڵاق داوە[١٤]..

وتومە بۆچی؟!

وتیانە: خێزانەکەمان سووکایەتی پێکردووین، لەسەر کێشەیەکی زۆر ئاسایی ناو ماڵ چوە شکاتی لێ کردووین و بە گرتنی داوین.. بۆیە تەڵاقمان داوە.

تەنها یەك حاڵەتیان نەبێت کە گەنجێك هات وتی مامۆستا خێزانی خۆم تەڵاق داوە، دەمەوێ بیگێرمەوە ژێر نکاحی خۆم.. وتم بۆ؟

وتی: لەلای بە ناو داکۆکی کارانی مافی ژن شکاتی لێ کردووم.. بەڵام دەڵێت پەشیمانم..

منیش وتم باشە کارەکە حەل دەکەین (ان شاء الله) رجعەت بە خێزانەکەت دەکەین، دێتەوە ژێر نکاحی خۆت.. بەڵام چەند

---

(١٤) لەبەر ئەوەی من مامۆستای ئاینیم بۆیە تێکەڵی کێشەکانی خەڵکیم وئاگام لە کێشەکانە.. یان زۆرێکیان کێشەکەیان هێناوەتە لام یان دوای کارەساتەکە پێیان ڕاگەیاندووومە.

ڕۆژێك بزر بوو، منیش لە هەواڵیم پرسی!! دیاربوو دەسگیر کرابوو، بۆیە ئەویش بەیەکجاری خێزانەکەی تەڵاق دابوو.

من لێرەدا لە ئێوە دەپرسم هەر لە جیران و خزم و کەسی خۆت بزانە چەند کەس بەو هۆیەوە تووشی تەڵاق بوونەتەوە!!
ئایا ئەوانە هاتوونە ئافرەت بەختەوەر بکەن، یان گیرفانی خۆیان گەرم بکەن و، ئافرەتانیش تووشی کێشە و تەڵاق بکەن؟!

# سەرهەڵدانی قەیرەیی

عێراق بوو بە یەکەم دەوڵەت لە ژمارەی قەیرەیی کچان:

لە تازەترین ئامار[١٥] کە لە عێراق و وڵاتانی عەرەبیدا کراوە، دەرکەوتووە کە زۆرترین ژمارەی قەیرە کچان لە عێراق تۆمار کراوە.

لە تۆێژینەوەیەکدا کە پسپۆڕێکی ئەردەنی لەسەر ئاستی نیشتمانی عەرەب ئەنجامیداوە و دەرکەوتووە کە وڵاتی عێراق، یەکەمین وڵاتە لە زۆریی ژمارەی قەیرە کچاندا.

(د. ئیسماعیل ئەلزیود)، توێژەری ئەردەنی و مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی کە بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەکە هەستاوە بەناوی «واقیعی قەیرەیی لەجیهانی عەرەبیدا»...

ڕێژەی هەرە زۆر لەعێراقدابووە کە (٨٥٪)ی کچانی عێراق، تەمەنیان لە (٣٥) ساڵ تێپەڕیوە و هێشتا شوویان نەکردووە و بە قەیرەیی ماونەتەوە[١٦].

یەکێك لە هۆکارەکانی قەیرەیی ئەوانەن، کە بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، هۆکارێکن بۆ سەرهەڵدانی قەیرەیی،

---

(١٥) ئاماری ساڵی: (٢٠١٠).

(١٦) ڕۆژنامەی هەولێر (١١-٠٥-٢٠١٠)، http://www.hawler.in/more.php?id=٦٤٧٤

بەوەی ڕێگا دەگرن لە ئازادی شەخسی ئافرەتێك، کە بە ویستی خۆی دەیەوێ شوو بە پیاوێك بکا کە ژنی هەیە[١٧]، ئەی ئەوە پێشێل کردنی مافی ئافرەت نیە، ئەوە ڕێگرتن لە ئازادی شەخسی ئەو ئافرەتانە؟ باشە ئەگەر ئافرەتێك تەمەنی بە ساڵا چووبوو، کوڕ پێی ڕازی نەبوو تەنها پیاوی خاوەن ژن پێی ڕازی بوو، ستەم نیە ڕێگری لێبکرێ شوو بە پیاوێکی خاوەن ژن بکا..

ئەگەر بڕوانین ئەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، زۆربەیان بۆ خۆیان قەیرەن و تەمەنێکی زۆریان بڕیوە شوویان نەکردووە ئومیدیان بە شووکردن نەماوە، بۆیە پێیان خۆشە هەموو ئافرەتێکی کوردستان تووشی قەیرەیی بێت و وەك ئەوان شوو نەکات..

لەمەش مەبەستیان بەرژەوەندی خۆیانە، بەوەی ڕەخنە لە ئایەتی قورئان دەگرن دەڵێن: ئیسلام ستەمی لە ئافرەت کردووە کە جائیزی کردووە پیاو لە ژنێك زیاتر بهێنێ، بەوەش ڕێگر دەبن بۆ چارەسەری قەیرەیی، ئەوان خۆیان هۆکارێکن بۆ قەیرەیی چۆن چارەسەری قەیرەیان پێ دەکرێ..

---

(١٧) پرۆژە یاسایەکیان دا بە پەرلەمان کە هەر ئافرەتێك شوو بە پیاوێك بکا ژنی هەبێ، دەبێ غەرامە بکرێ و سزا بدرێ.

خاتوو ڕێکپۆش عەزیز: پێی وایە چارەسەری قەیرەیی بەوەیە کە لە ئەورپاوە بە لۆری لەعابەی ئۆتۆماتیکی سێکسی[١٨] بۆ کوردستان بهێنین کە دەڵێت:

"گەر ئێمە بزوتنەوەی راستەقینەی فێمێنیزممان هەبووایە، دەبوو بە لۆری لەعابەی ئۆتۆماتیکی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە، چونکە یەکێك لەپاساوەکانی ئەوان بۆ مەسەلەی فرە ژنی ئەوەیە، کە ژمارەی ژن زیاترە لەپیاو لە کوردستان، گەر پێوانەی ژن بەپێی گونی پیاو بێت، ئەوا زۆر لەعابەی سێکسی ئۆتۆماتیکی هەیە کە زۆر لەو پیاوانە باشترن بۆ ژن کە باوەڕیان بە فرە ژنی هەیە، رەنگە ژن لە رێی ئەو لەعابەیەوە باشتر بە پلەی ئۆرگاسم بکات، تا ئەو پیاوەی ژن دەکاتە کۆیلەی خۆی و لەشی بەکار دەهێنێ بۆ مەسەلەی سێکس"[١٩].

(١٨) لەعابەی ئۆتۆماتیکی جنسی، لاستیکە لەسەر شێوەی زەکەری پیاو دروست کراوە، لە کوردستان شتی وا نیە چونکە تا ئێستاش ئافرەتانی کوردستان ئاوا لە ڕووی ئەخلاقی دانەرووخاون تا بزانن لەعابەی ئۆتۆماتیکی جنسی چیە و چۆن بە کاردێ، بەڵام لەو وڵاتەی (ڕێکپۆش عەزیز) دەژیی ئەو لەعابە هەیە بۆ خۆی ئەزانێ کە ئەم لەعابانە چۆن بە کاردێ! و چێژی چۆنە!

(١٩) سایتی، http://www.emrro.com/rekposheziz.htm.

خاتوو تامان شاکر: پێی وایە چارەسەری قەیرەیی بەوە دەکرێت، کە پیاوان وەکو کەل و پەل لە وڵاتانی تر بهێنین بۆ کچەکانمان، شوێنێکیشیان بۆ ئامادە بکەین تا کاری خۆیان بکەن کە دەڵێت:

"-قەیرەیی چارەی هەیە- دەبینین لە ئەڵمانیا دوای شەڕی جیهانی دووەم پیاویان -لە هەموو لایەکەوە دەهێنا بۆ وڵاتەکەیان- لە تورکیا لە ئیتاڵیا لە سربیا، ئەوە حوکمەت دەتوانێت ئەو کێشەیە چارەسەر بکات، بەوەی ڕێژەیەکی پیاو -لە وڵاتانی تر- بهێنێت بۆ ئێرە"[٢٠].

یان زۆرێک لەو ئافرەتانەی کە ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنەکان بە ئەمان و زەمان گرتووە، گوایە داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، کەچی دەبینین قسەکانیان هەموو بۆ بەرژەوەندی مادی خۆیانە و هیچی تر، بۆیە خۆشیان گاڵتەیان بە قسەی خۆیان دێت و بۆ بەرژەوەندی خۆیان عەمەل بە قسەی خۆیان ناکەن، نموونەش زۆرە لەو بارەوە کە ئەم ڕاستیە بسەلمێنێ، لەوانە:

---

(٢٠) لە قەلآت tv میوان بوو لە بەرنامەی (تیشك) بەرواری (٢٠٠٨/٤/٦) کاتژمێر (٠٨،٣٠)ی ئێوارە.

(ك.ح) ئافرەتێکە کە شاعیرو رۆژنامەنووس و هەڵسوڕاوی بواری مافەکانی ژنان بوو و بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت کردووە، یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی بەردەوام بەگژ کەلتور و فەرهەنگ و ئاییني میللەتەکەیدا چوە و بەتوندی داکۆکی لە مافەکانی ئافرەت دەکرد و دژایەتی پیاوسالاریی راگەیاند، هەر لەسەر پێشنیاری ئەوبوو، بڕیاری قەدەغەکردنی فرەژنی دەرکرا، کەچی ئێستا دەبینین وەك داکۆکیکارەکانی پێش خۆی، دەستی لە بیروباوەڕەکەی هەڵگرت سەربەهەویّ شوو بە پیاوێکی خاون ژن دەکات..[21] کاتێکیش لە دایکی دەپرسن دەڵێت:

"هەموو دایکێك حەزدەکات کچەکەی بچێتە ماڵ و مێردی خۆی (ك.ح)یش وەك هەموو هاوڕێکانی ئەو مافەی هەیە"[22].

ئەی بۆ دیارە دایکی خەڵکی حەزناکات کچەکەی شوو بکات؟!

(ب.ن) [23] ئافرەتێك بوو سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕ.پ) بوو گوایە بەردەوام داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکات، بەوەی

---

http://www.standardkurd.net/Direje.aspx?Cor=Hewal&Jimare=٩٦(٢١)

http://www.awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&jimare=٢٤٢(٢٢)

ئافرەت لەلایەن پیاوەوە ستەمی لێ کراوە لەبەر ئەوەی سەر بە هەوێ دەدرێت، کەچی بۆ خۆی شووی بە پیاوێک کرد کە ژنێکی تری هەبوو، جا کاتێك لێیان پرسی ئایا ڕاستە شووت بە پیاوێکی خاوەن ژن کردووە؟ لە وەڵامدا گووتی:

"بەڵێ من وەك هەموو ئینسانێك پیویستم بە ژیانی تایبەتی خۆم هەیە و شووم کردووە"

دیارە تەنها خانم پێویستی بە ژیانی تایبەت هەیە و خەڵکی تر پێویستی بە ژیان نیە و با شوو نەکەن[٢٤].

ئافرەتێکی تر کە ئەندام بوو لە یەکێك لە ڕێکخراوەکانی ژنان، شووی بە پیاوێك کرد کە خاوەن ژن بوو و(٩) منداڵی هەبوو[٢٥].

---

(٢٣) ناوەکانم لەلایە بەلأم بۆیە بە بیت نووسیومە جونکە شووکردنیان بە پیاوی خاوەن ژن، من بەشتێکی باشی نەزانم وپشتگیر ودەستخۆشیان لێ دەکەم، بەلأم کێشەکە لێرەیە کە ئەوان پێشتر ئافرەتانیان فریوو داوە وەی کە شووکردن بە خاوەن ژن ستەمە ئیسلام کردوویەتی.

(٢٤) سایتی: کوردستانیوز.

(٢٥) سایتی: کوردستانیوز.

(ن.س) ئافرەتێکی ترە گوایە زۆر داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکات، گلەیی لە فرەژنی هەبوو و بە ستەمی ئەزانی، پاشان خۆی شووی بە پیاوێك کرد کە پیاوەکە دوو ژنی تری هەبوو، دواتر تەلاقی وەرگرت و دیسان مێردێکی تری کرد.

هەروەهاش ئەو پیاوانەی بەرگرییان لە مافی ئافرەت دەکرد (ئافرەتانی تەمەن ١٤-٣٠ ساڵ)، کەچی دوایی ژنی دووەم و سێیەم و هەتا پێنجەمیشیان هێنا[٢٦].

ئافرەتێك دەیەوێت شوو بە پیاوێکی خاوەن ژن بکات ڕێگای لێ دەگرن و ناهێڵن و دەڵێن مافی پێشێل کراوە، تا وای لێ دێ ئەو ئافرەتە دووچاری قەیرەیی دەبێتەوە، بەڵام بۆ خۆیان دروستە شوو بە پیاوی چوار ژنیش بکەن.

---

(٢٦) http://www.standardkurd.net/Direje.aspx?Cor=Hewal&Jimare=٩٦

## ڕێخۆشکردن و هاندان بۆ کاری بەدڕەوشتی و لەشفرۆشی

ئەگەر بڕوانیینە ئەو بەڵێننامە نێو دەوڵەتیانەی کە ئەو ڕێکخراو سەنتەرانە کار بۆ چەسپاندنی دەکەن و شەری لەسەر دەکەن، زۆر بە ڕوونی بانگەشەی لەشفرۆشی و بەڕەڵای جنسی دەکەن.. لەوانە:

{پێویستە لەسەر هەموو شارەکان کە پێداویستیەکانی (خستنەوەی منداڵ بە دروستی)[٢٧] دەستەبەر بکەن بۆ هەموو ئەو کەسانەی تەمەنیان شیاوە بۆ ئەم کارە، ئەویش بە زووترین کات کە نەگاتە ساڵی (١٤٣٦ك-٢٠١٥ز)[٢٨]، پێویستە پێداویستیەکانی (خستنەوەی منداڵ بە دروستی) ئەو خزمەتگوزاریانە لە خۆ بگرێ: دابین کردنی ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەپارێزێ لەو نەخۆشیانەی لە کاتی ئەنجامدانی کاری

---

(٢٧) خستنەوەی منداڵ بە دروستی: واتە: هەموو کوڕ وکچێك بۆی هەیە ڕابوێرێ بە ئازادی، دەبێت ئەو منداڵە ناشەرعیەی ئەشیان بێ بە ئازادی بێ، واتە: ئەگەر کچێك سکی بە حەرام پەیاکرد، دەتوانێت بچێتە لای دکتۆر تا بەرنگایەکی تەندروست منداڵەکەی ببێت، یان بەرنگایەکی تەندروست فێر بکرێ چۆن زینا بکات و تووشی حەملیش نەبێت، یان شوێنێك بکرێتەوە بۆ ئەو منداڵانەی ئەیان بێت.

(٢٨) ئەوان بڕیاریان داوە کە دەبێت ئەو لێشاوە بەد ڕەوشتیە بە زووترین کات لە هەموو جیهان بلاوکرێتەوە کە نەگاتە ساڵی (١٤٣٦ك-٢٠١٥ز).

جنسی پەیدا دەبێت، یان شێوازەکانی تری (خستنەوەی منداڵ بە دروستی) }[٢٩].

{پێویستە یارمەتی تەواوی ماددی و ماڵی ئەو ڕێکخراو و سەنتەرە نا حوکمیانە بدرێت کە کار بۆ لاوان دەکەن، تا ئەوانیش بتوانن داواکانی لاوان بە ڕێگایەکی دروست بهێننە جێ، لەوانە ئەنجامدانی کاری (جنسی تەندروست)[٣٠] و (خستنەوەی منداڵ بە دروستی)}[٣١].

{بۆ ئەوەی پێگەی ئافرەت بە هێز و دیار بێت دەبێت ئافرەت خاوەن بڕیاری خۆی بێ لە هەموو بوارەکانی ژیان، بە تایبەت لە بواری ڕابواردنی جنسی و منداڵ خستنەوە}[٣٢].

---

(٢٩) تقرير المؤتمر الدولي للسكان والتنمية/القاهرة، ١٩٩٤م: الفصل السابع – ألف/٧-٦ ص٤٤.

(٢٠) جنسی تەندروست، واتە: فێری لاوان بکرێ چۆن کاری زینا بکەن و ئازاد بن و کەس ڕێگایان لێ نەگرێت و شوێنیان بۆ بکرێتەوە بۆ ئەم کارە، تاکو بە ڕێگایەکی تەندروست زینا بکەن.

(٣١) تقرير المؤتمر العالمي الرابع المعني بالمرأة/بكين، ١٩٩٥م: الفصل الرابع – جيم/ ١١١ ( ب) ص٦٣.

(٣٢) تقرير المؤتمر الدولي للسكان والتنمية/القاهرة، ١٩٩٤م: الفصل الرابع – ألف/٤-١، ص٢٤.

{پێویستە هەموو ئەو پێشێلکاریانەی دژی ئافرەت بنبڕ بکرێ، دەبێت یارمەتی ئافرەت بدرێ بۆ هەر کارێك وبڕیارێك کە دەیەوێت ئەنجامی بدات، لە نێو ئەو مافانەش مافی منداڵ خستنەوە و ڕابواردنی جنسی}[٣٣].

فێمێنیزمەکانی لیبراڵ و ڕادیکاڵ سەبارەت بە لەشفرۆشی دەیانەوێت بە باشترین شێوە سەیری دیاردەکە بکەن.

لە ڕەوتە لیبراڵیەکەدا زۆر نووسەر هەن کە داوای ڕیفۆرم دەکەن بۆ ئەوەی ڕێز لە لەشفرۆشی بگیرێت و دەڵێن ئەوەندە بەس نیە کە خەڵك ئازاد بێت بۆ لەشفرۆشی... بەڵکو دەبێت ئێمەش ڕێزیان لێ بگرین و ڕەفتارمان چاك بکەین بەرانبەریان و بەکارێکی ئاسایی بیبینین، بە جۆرێکیش مامەڵەی لەگەڵ بکرێ وەك هەر جۆرە چالاکیەکی ئابوری تر سەیر بکرێت... ئەوان وا دەبینن کڕینی چێژی سێکسی وەك هەر چێژێکی ئارام بەخش و کات بەتاڵی وایە.

بۆ نموونە مرۆڤ بۆ تێرکردنی ئارەزووی یاری کردن دەچێتە شاری یاری وگازینۆکان و یانەکان... هتد پارەش دەدات،

(٣٣) تقرير المؤتمر الدولي للسكان والتنمية/القاهرة، ١٩٩٤م: الفصل الرابع – الف/٤-٤، ص٢٥.

کڕینی سێکسیش وەك هەمان بازرگانی سەیردەکەن و بە یەکێك لە پیشەسازییەکانی چێژبینینی لە قەڵەم دەدەن[34].

خاتوو شاناز برزنجی[35]: مارەبڕین بە پاکی بە شتێکی بۆگەن ئەزانێ.. بەڵکو ئەو بە باشی دەزانێ کورە و کچە پێش مارەبڕین زینا بکەن ئینجا زەواج بکەن کە دەڵێت:

"سەردەمانی پێش ئیسلام و بەڕێژەیەکی کەمتریش پاش سەپاندنی ئیسلام بەسەر زۆرینەی کوردا و تا ئێستاش دیاردەی هەڵبژاردنی ئارەزوومەندانەی نێر و مێ لە نێو کوردا هەبووە و هەیە و بە ئاساییش سەیر کراوە، ئێزیدییەکان ئەو جۆرە هەڵبژاردنە لەنێوان کچان و کوڕانیاندا هەیە، ئەو دووانەی یەکتر هەڵدەبژێرن پێشتر لەگەڵ یەکتر دەڕۆن و پاش ئەنجامدانی کاری سێکسی[36] ئینجا خێزانی کوڕە دەچن بۆ داوای کچە، ئەم چەشنە هەڵبژاردن و کولتوورە مرۆڤ دۆستە[37]

(٣٤) ئۆڤیانووسێك لە تاوان (ل: ٧٥) خەندان محمد جەزا.

(٣٥) نەوەکانی بەرزنجی هەمووی ڕێز وپایەی خۆیان هەیە لای نێمەی کورد، بەڵام تەنها کەسێك واناگەیەنێت کە بەرزنجیەکان خراپ بن.

(٣٦) مەبەستی ئەوەیە دوای زینا دەکەن بە حەرامی.

(٣٧) ئەو زینا بە شتێکی باش و کلتورێکی مرۆڤ دۆست دەزانێ.

لە زۆر شوێنی تری کوردستانیش هەبووە و هەیە[٣٨]، کەواتە ئەو تێڕوانینە بۆگەنە نێرسالارییەی پیاوانی کورد زادەی تێڕوانینی مێژووی کۆنی کورد نییە ئەوەندەی زادەی تێڕوانینی بۆگەنی ئاینی ئیسلامە[٣٩]، هیچ شتێك هێندەی ئیسلام کاریگەری بەسەر کوردەوە نەبووە، لەڕێی ئەو ئاینەوە هەرچی کلتوور و فەرهەنگی ناشیرین و خراپی عەرەب هەیە گوێزرایەوە بۆ کورد و سیمای کۆمەڵی کوردی بە نێگەتیف گۆڕی"[٤٠].

خاتوو ڕێکپۆش عەزیز دەڵێت: "ئەگەر کچ و کوڕ یەکیان خۆشویست دەبێ ڕەدوو بکەون"[٤١].

زۆرێك لەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، لە ڕاستیدا تەنها مەبەستیان بەرژەوەنی خۆیانە و هیچی تر، کچێك ئەگەر شووبکات و لەگەڵ پیاوەکەی باش بێت دەڵێن

---

(٣٨) خۆشەویستان هەموومان خەڵکی کوردستانین کەی زینا لە ناو کوردی بەشەرەف شتێکی باش بووە.

(٣٩) ئەو مارەبڕینی شەرعی لەسەر ڕێگای ئیسلام بە بۆگەن ئەزانێ.

(٤٠) سایتی: http://www.emrro.com/estaykicani.htm

(٤١) http://www.civilmag.com/news/komelaiaty/K٥٢٠٠٧/aven٥٢٠razez/index.php

ئەوە لەلایەن پیاوەکەیەوە مافی پێشێل کراوە بە چەندین قسەی سەر قۆزی بن ئالۆز مالْ لەو ئافرەتە تێك دەدەن، هانی ئافرەتان دەدەن تاکو لە ماڵەوە لەگەڵ پیاوەکانیان یان باوکیان یان براکانیان بە شەڕ بێن و دواتر ماڵ بە جێ بهێڵن و ڕوو بکەنە ئەوان، بۆ ئەوەی کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن، ئەوانیش بۆ مەرامی خۆیان بە کاریان دەهێنن، یان بە ناوی ئازادیەوە وا لە ئافرەتان دەکەن کاری وا بکەن کە لەگەڵ کۆمەڵگای ئێمە ناگونجێ دواتر ئەو ئافرەتانە تووشی کێشە دێن لەگەڵ خێزانەکانیان، بۆیە دەبێت هەڵبێن لە ماڵ و ڕووبکەنە ئەوان ئەوانیش داڵدەیان نادەن و گاڵتەیان پێ دەکەن، ئەوکاتی ئەو ئافرەتە دەکەوێتە سەرجادە و تووشی کەسی خراپ ئەبێ وتووشی کاری بێ ڕەوشتی دەبێت.

**چەندین نموونەی زیندوو لە کوردستان:**

**(ن.ف.ک) کچێکی عەرەبی تەمەن ١٤ ساڵە ماڵی لە بەغدا ئەبێ، بە گوێی باوکی ناکا و لە ماڵ هەڵدێ، دێ بۆ (سلێمانی) کە لێی ئەپرسن بۆ هاتی بۆ کوردستان دەڵێت:**

**هەندێ لە هاوڕێکانم باسیان دەکرد کە لە کوردستان سەنتەر و ڕێکخراو هەیە لەسەر (حقوق المرأه) داکۆکی لە مافی ئافرەت ئەکەن.. ئەت بەن بۆ خاریج...[٤٢].**

**ئەو کچە کە دێتە (سلێمانی) تووشی زۆر نەهامەتی و کاری خراپ و کەسی خراپ دەبێ.. دواتر تووشی خاوەن تەکسیەک دەبێ بە ناوی (سەرکەوت) کوڕێکی بە دین و خاوەن ڕەوشت دەبێ..**

**(سەرکەوت) بە تەکسیەکەی خۆی سێ ڕۆژ ئەو کچە بەسەر هەموو سەنتەر و ڕێکخراوەکانی شاری (سلێمانی) دەگەڕێنێت هیچ کام لەو سەنتەر و ڕێکخراوانە وەری ناگرن.. زیاتر لە (١٠٠) تەلەفۆن ئەکا بێ سوودە..[٤٣] باوکی (سەرکەوت)یش لە ترسی ئەوەی تووشی کێشەی یاسای نەبێت ناتوانێ ئەو کچە لە ماڵەکەی خۆیان بهێڵێتەوە.. بۆیە کچەکە دەکەوێتە سەر**

---

(٤٢) ئۆقیانووسێك لە تاوان (ل: ١٤٣) خەندان محمد جەزا.

(٤٣) ئەوان تەنها مەبەستیان تێك دانی خێزانە.. ئەیانەوێ ئافرەتەکان لە ماڵ هەڵبێت پاشانیش ئەوان وەریان نەگرن و تووشی بەدڕەوشتی ببن.

جادەکـان و تووشـی کـاری بەدڕەوشـتی دەبێـت و بانـدەکانی لەشفرۆشی ئیستغلالی ئەکەن و کاری لەشفرۆشـی پێ ئەکەن و ئـەبێت بە لەشـفرۆش.. کـە تـا ئێـستا ئـەو کـچە سـاڵێکە کـاری لەشفرۆشی ئەکات[٤٤].

لەژمارە (٢١١)ی "هەفتەنامەی ئاوێنـە"دا ژنێك بەناوی هاژە دەڵێت: هەڕەشەی کوشتنم لەسەر بووە و لە ڕێکخراوی ئاسودە دەریـانکردوم، زۆریـان لـێ پارامـەوە کـە ئەگـەر بڕۆمـە دەرەوە کـەس نییـە بمگرێتـە خـۆی و دەکـوژرێم بـەڵام سـودی نـەبوو، وتیان برۆ دەرەوە چیت لێدێت با ببێیت...

دوای دەرکردنی لەبەردەم ڕێکخـراوی ئاسـودەدا تەکسییەکی گرتـووەو ئـەو شـۆفێری تاکسیە دواتـر بردویەتیـە لای خـۆی‌و کاری لەشفرۆشی پێوە کراوە...

ئـەم کەیـسە گلـەیی زۆری لـە ڕێکخـراوی ئاسـوودە هـەبوو، باسـی لـەوە دەکـرد کـە پەنجـە مـۆری بـە زۆر پێکـراوەو لـە شێڵتەرەکە دەرکـراوە و ئەوەشـی پـێ وتـراوە کـە نـاتوانین لـەوە زیاتر لای خۆمان بتهێڵینەوە لەبەر ئەوەی تۆ کەیسی ئێمە نیت.

---

(٤٤) ئۆقیانووسێك لە تاوان (ل: ١٥٢-١٥٤-١٥٥) خەندان محمد جەزا.

ئـــەم نموونەیـــە پێمانـــدەڵێت کەشـــێڵتەرەکانیش بوونەتـــە سەرچاوەی توندوتیژی دژ بەئافرەتان...[٤٥].

(م.س.ت) ئافرەتێکی تەمەن ٢٦ ساڵە دەڵێت:

لە ماڵ هەڵاتم چووم بۆ یەکێك لە ڕێکخراوەکان، باسی هەموو ژیانی خۆم بۆ کردن، کە لە منیان دەپرسی جاریٚ خەمی خۆیان بوو ئەیان ووت: ئۆ ئەوە مێردەکەی منیش بیرم کەوتەوە فلان شت!

یان یەکێکی جیقنی لیٚ بوو زوو زوو ئەیووت "بەسە توخوا وسبە زۆر بیٚ زەلەتی" وای ئەزانی من ڕامکردووە بۆ مەتعەم هاتووم!

بیٚ زەلەتی چی من تێمهەڵدراوە باسی مێردەکەم ئەکەم، ئەو لەبری ئەوەی بۆم حەل کات!

ئاخر من چۆن بڕوام بە سەنتەر و ژن ومن هەیە! هەمووتان درۆ ئەکەن.. ئیتر دوایی هەتا سیٚ سەعات مناقەشەیان بوو بمبەن بۆ کویٚ!

---

(٤٥) ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی (WOLA) سایتی: www.kurdistanonline.net

ووتم: لەسەر جادە یان لەو حەوشە ئەخەوم ووتیان: نابیٚ دادەگیان هەر چۆنیٚ بوو ئەو شەوە هێشتمیانەوە لێرە ووتیان بخەوە بەلاٌم دەسکاری هیچ مەکە...

بۆ بەیانی کچەکان هاتن و هەر کەسێکیان ئەهات شتی لیٚ ئەپرسیم، ڕۆژی پێشوو چیم ووتبوو عەینەن شت، یەکیٚ سەعات ٨ هات هەمووی لیٚ پرسیم، یەکێکی تر سەعات هەشت ونیو، یەکێکی تر سەعات ٩، تابوو بە سەعات (١٠) سەد جارم گێڕاوەتەوە، منیش زۆر تووڕە بووم ووتم شتێکم بۆ بکەن ئەگینا ڕادەکەم.. خۆ من ڕادیۆ نیم هەر بیڵێمەوە و بیڵێمەوە..

ئەو ژنە دەڵێت: ئینجا منیان بردەوە بەرەو ماڵ، ووتم: باشە ئێستا ئێوە بۆ من ئەبەنەوە؟! بۆچی شکاتم بۆ ناکەن؟ ئەی ئێوە قسەی زل بۆ ئەکەن[٤٦]؟

ووتیان: دادەگیان ئێمە ناتوانین ئەوە کێشەی زۆری لیٚ ئەبێتەوە ئەبێت خۆت بچی، ئینجا کیٚ ئەڵیٚ تۆ ڕاست ئەکەی[٤٧]!

سەرەنجام ئەو ئافرەتە چونکە شوێنێکی نابیٚ و ئەوانیش دالٌدەی نادەن، دەکەوێتە سەر جادەکان بۆیە تووشی کاری بەد

---

(٤٦) ئەوانە تەنها قسەی زل زل دەکەن و هچی تر، ئەویش بۆ کاسبیەکەی خۆیان تا ئافرەتانی پیٚ هەڵخەلەتێنن.

(٤٧) تووشی کێشەکەیان کردووە باوەڕیشی پیٚ ناکەن.

ڕەوشتی ئەبێ و باندەکانی لەشفرۆشی ئیستغلالی ئەکەن و کاری لەشفرۆشی پێ ئەکەن و ئەبێت بە لەشفرۆش[٤٨].

(ماڵی خانزاد) یەکێکی ترە لەو سەنتەرانەی بە ناو بۆ داکۆکی کردن لە مافی ئافرەت دامەزراوە.. کەچی دەرکەوت ئەو ئافرەتانەی لەوێبوون بازرگانیان پێوە دەکرێ و کاری بەدرەوشتیان لەگەڵ دەکرێ..

(سوعاد) یەکێك لەو ئافرەتانەی لەوێ بووە دەڵێ:

کۆمپانیایەك لە نزیك ماڵی خانزاد هەبوو.. هەمووی پیاو کاری تیا دەکرد پەیوەندی سەیر لە نێوان کچەکانی ماڵی خانزاد و ئەوان دروست ببوو، لەلای بەڕێوەبەری ماڵی خانزاد ئەو شتانە زۆر ئاسایی بوو...

(سوعاد) دەڵێت: چەندین جار ئافرەتەکانی ئەوێ لەگەڵ پیاوانی کۆمپانیاکە و خاوەن کۆمپانیاکە و پاسەوانەکانی ماڵی خانزاد نوستوون.. ئەو پەیوەندیەش شتێکی ئاشکرابووە[٤٩].

---

(٤٨) نۆڤیانووسێك لە تاوان (ل: ٩٥-٩٦-٩٧) خەندان محمد جەزا.

(٤٩) ڕۆژنامەی میدیا (ژ: ٢٩٥/ل: ١٧) ساڵی ٢٠٠٧/٦/٢٦.

(سوعاد) دەڵێت: ڕۆژێکیان خاوەن کۆمپانیاکە پەلاماری دام... ڕۆژێکی تریان نووستبووم.. چاوم کردەوە بینیم لە باوەشی پیاوێکم! سەیرم کرد برای بەڕێوەبەری ماڵی خانزادە داوای کاری جنسیم لێ ئەکا منیش بە هەر چۆنێك بێت خۆم لێ ڕزگار کرد(٥٠).

ئەوانەی لەوێ بوونە چەندین حاڵەتی پێشێل کاری و بەدڕەوشتی دەگێڕنەوە کە لەگەڵیان کراوە.

---

(٥٠) ڕۆژنامەی میدیا (ژ: ٢٩٥/ل، ١٧) ساڵی ٢٠٠٧/٦/٢٦.

## بەرپاکردنی دژایەتی لە نێوان (نێر ومێ).

ئەم وێنەی خوارەوە لە ساڵنامەی (٨مارس) بڵاوکراوەتەوە، کە یەکێتی ژنانی کوردستان دەریدەکات، لەم وێنە کاریکاتێریە دەبینین ژن وپیاوێك دانیشتوون پشتیان بە یەکەوەیە، ژنەکە بیر ئەکاتەوە بیرکردنەوەکەی بریتیە لە ئاشتی و سۆز و عاتفە کە کۆتری سپی لە خەیاڵاتی دەردەچێ، پیاوەکەش بیر ئەکاتەوە بیرکردنەوەکەی بریتیە دژایەتی و شەر و دڕندە بۆیە دێوەزمە و دڕندە لە خەیاڵاتی دەردەچێ.



(٥١)

---

(٥١) ٨ مارس ژمارەی (١١)ی ساڵی ٢٠١٠/٢/٨.

ئامانجی سەرەکی ئەو جەندەریانە بریتیە لە بەرپاکردنی دژایەتی لە نێوان (نێر ومێ)؛ ئەوان ئامانجیان ئەوە نیە کە هەوڵبدەن بۆ باش کردنی حاڵی ئافرەتان بەڵکو ئەوان هەوڵدەدەن بۆ چاندنی تۆوی دوو بەرەکی و دژایەتی لە نێوان نێر ومێ).

لەلای ئەوان ئاوا تەفسیری نێوان خێزان ئەکرێ.. کە بەردەوام ژن و پیاو دژی یەکن و بەرانبەر یەك وەستاون بۆ جەنگ.. بەردەوام دەڵێن پیاو هۆکاری هەموو کێشەیەکە..

وەك خاتوو ئەڵماس مستەفا دەڵێت: هۆکاری سەرەکیی زۆربوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان پیاوانن[٥٢].

**ئافرەتیان وا تێگەیاندووە کە پیاو تۆی کردۆتە کویلە تۆش مرۆڤی وەك ئەو، کەواتە هەر کاتێ ئامۆژگاری کردی وەری مەگرە.. چونکە عەقلی تۆش وەك ئەوە.. کار لە ناو ماڵ بۆ پیاوەکەت مەکە چونکە ئەوە چەوسانەوەیە.. ئەگەر قبوڵت کرد دەکا تۆ نەخۆشی و تەواو نیت.**

---

(٥٢) http://www.amroyzanko.com/index.php?option=com_content&view=article&id=٧٠٥:٢٠١٠-٠٦-١٧-١٣-٥٧-١٩&catid=٣٦:wtar&Itemid=٥٥

هانی ئافرەت ئەدەن کە قبوڵی حیوار نەکات هەر کاتێك کێشەیەکی لەگەڵ پیاوەکەی یان برایەکەی هەبوو تەنەزول نەکات با هەڵبێت لە ماڵ و هانا بۆ ئێمە بێنێت تا ئێمەش یارمەتی بدەین و دیفاعی لێ بکەین.. کاتێکیش ئەو ئافرەتە بە گوێیان ئەکات و کێشە لە ماڵ دروست ئەکات و هەڵدێ وهانا بۆ ئەوان ئەبا، ئەوان لەبری ئەوەی یارمەتی بدەن گاڵتەی پێ ئەکەن..

"شنۆ" کچێکی تەمەن ٢٣ ساڵە و لە قۆناغی سێی ناوەندی دەخوێنێت، لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە ڕێکخراوی ئاسوودەی ناسیوە و بۆ چارەسەری کێشەیەکی پەنای بردۆتە ئەوێ، دوای سەردانی بۆ ڕێکخراوی ئاسوودە کێشەکەی ئاڵۆزتر بووە.

شنۆ بەم شێوەیە باس لەکاتی مانەوەی خۆی دەکات لەڕێکخراوی ئاسوودەکە ماوەی دوو هەفتە لەوێ ماوەتەوە:

"ئەو شوێنەی تێیدا بووم وەك زیندان وابوو، زۆر حەزم دەکرد لەو شوێنە ڕزگارم بێت، جۆری کێشەکەم یاسایی و کۆمەڵایەتی بوو، لە ڕووی یاساییەوە هیچم بۆ نەکرا، پارێزەری

تایبەتم نەبوو دوای هاتنە دەرەوەم هیچ بەدواداچوونێك بۆ کێشەکەم نەکرا... لە کاتی مانەوەمدا سزادانی دەروونیم لەشێڵتەرەکەدا بەدیکرد، ئەویش بەقسە پێوتن و ئیهانەکردنمان بە قسەی نەشیاو، هیچ هاوکارییەکیان نەدەکردین نە لە ڕووی دەرونیەوە و نە لەڕووی تەندروستیەوە، بەڕێوەبەری ئەم ڕێکخراوە هیچ کات هەڵنەدەستا بە ئەرکی لێپرسینەوە لەگەڵ کارمەندەکان لە کاتی بوونی سکاڵادا، لەسەر ڕەزامەندی خۆم شێڵتەرم بەجێهێشت لەبەر ئەوەی تەواو بێزار ببووم[٥٣].

خاتوو گولاڵە پشدەری دەڵێت: ئەگەر ژن لە چوارچێوەی تەنیا ڕۆڵی هاوسەرایەتی و دایکایەتی دابێت ئەوە ئەو کۆمەڵگایە نەخۆشە[٥٤].

(٥٣) ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی (WOLA) سایتی: www.kurdistanonline.net

(٥٤) ڕۆژنامەی کوردستان ڕاپۆرت (ژ:٤١٥/ ل: ٨).

# ڕێگا خۆشکردن بۆ سووتان و ژن کوژی

ئەوانەی بانگەشەی بە ناو ئازادی ئافرەت ئەکەن هۆکاری سەرەکین بۆ زیادبوونی ڕێژەی خۆ سووتاندن و ژن کوژی.. چونکە ئەوان خۆسووتاندن بە شتێکی زۆر باش ئەزانن و ئەڵێن شێرە ژن بوو تەنەزولی نەکرد بۆ خێزانەکەی خۆی سووتاند لە بری ئەوەی خۆ سووتاندن لە پێش چاوی ئافرەتان ڕەش بکەن شیرینی دەکەن..

خاتوو خانم رحیم دەڵێت: ژنان هۆشیاربوونەتەوە چیتر ژێر دەستەیی قبولْ ناکەن، تەنانەت زیادبوونی کوشتنی ژنانیش هەر ئەوەیە...[55].

کاتێک کاک ئەرسەلان مەحمود دەپرسێت: ئەو هۆکارانەی مرۆڤ بەرەو خۆکوشتن و خۆسوتاندن دەبەن چین، دواجار بڵێی ئەو دوانەیە ئافرەتی کورد بەرەو کویْ دەبەن، ئایا ئەوەجۆرێك لە شێتی و خۆبەدەستەوەدانی قەدەر بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە ناگەیەنێت؟..

---

(٥٥) ڕۆژنامــەی هاولاتی (ژ٣٩٩، ل: ١٥) ساڵی ٢٠٠٨/٢/٢٤.

**لە وەڵامدا خاتوو گۆنا سەعید دەڵێت:** نەخێر ئەوە شێتی نییە، ئەوە پەیامی ژنانە بەم شێوەیە لە ژیان كە بەسەریاندا سەپێنراوە و كە نایانەوێ قبوڵی بكەن و لەهەمان كاتدا هیچ چارەسەرێكیان نییە بۆ رزگار بوون لەدەستی. هەر ژنێك بەهەر هۆیەك خۆی ئەسوتێنێ مانای ئەوەیە شتێك نوقسانە لەم كۆمەڵگەیەدا بە رادەیەك كە ئینسانەكان تێیدا بەرگەی ژیان ناگرن[٥٦].

بە ئافرەتان دەڵێن كە بینیت پیاوەكەت یان براكەت قسەیەكی پێ ووتی قبوڵی مەكە و بەرەنگاری بەوە چونكە تۆش وەك ئەو بەشەری مردن باشترە لەو ژیانە.. كە كێشەشت بوو وەرە بۆ خۆمان بۆت حەڵ دەكەین، هێندێ لە ئافرەتانیش بە گوێیان دەكەن و كێشە دەنێنەوە و هەڵدێن و دەچنە لای ئەوان پاشان چی ڕوودەدا؟؟؟

كاتێك كابرا ئەبینێ خێزانەكەی یان خوشكەكەی یان كچەكەی هیچ ڕێزێك بۆ ئەوان دانانێ و هەڵدێ و ماڵ بە جێ دەهێڵێ و شەوان لەسەر جادە دەخەوێ لەو سەنتەرانەش شكات لە كەس وكاری خۆی دەكات دەڵێن كچەكەمان سەری

(٥٦) http://www.emrro.com/gonasehidher.htm

شۆڕ کردین.. بۆیە ئەچن هێندێ پارە ئەدەنە خاوەن سەنتەرەکە تا کچەکەیان تەسلیم بکاتەوە.. دواتر بە کوشتنی ئافرەتەکە کۆتایی پێ دێ.

یەکێك لەو ئافرەتانەی (ماڵی خانزاد) بە ناوی (رازاو) دەگێڕیتەوە دەڵێت:(٥٧)

(هاوژین) یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کە درایەوە دەست باوکی ودوای چەند ڕۆژێك برا و باوکی بە بلۆك کوشتیان..

کە باوکی هاتە ماڵی خانزاد هاوژین خۆی لە حەمامەکە نابوو، بەڕێوبەری ماڵی خانزاد فەرمانی دا بیهێننە دەرەوە، هاوژین هاواری دەکرد ودەگریا.. بەڵام ئەوان هێنایان ودایانە دەستی باوکی...

(رازاو) دەڵێت: دوای دوو ڕۆژ من لە پرسگە دانیشتبووم چاوەڕوانی هاتنی نانم دەکرد، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا، هەڵمگرت باوکی هاوژین بوو، گووتی: <u>سوپاسی هاوکاریتان دەکەم ئەوە کچەکەم کوشت</u>(٥٨).

---

(٥٧) (ماڵی خانزاد) یەکێکە لەو سەنتەرانەی بە ناو بۆ داکۆکی کردن لە مافی ئافرەت دامەزراوە.

(٥٨) ڕۆژنامەی میدیا ژمارد (٢٩٦-٢٩٥)ی ساڵی ٢٠٠٧/٦/٢٦.

ڕۆژی ٢٠٠٩/٩/٩ کچێك بەناوی (ژیان عەلی) لە ناو باخی خۆیاندا کوژراو کرا بەژێر گڵەوە، پێشتر ئەم کچە لە شێڵتەری ڕێکخراوی ئاسودە داڵدەدراوە[٥٩].

کاتــژمێر ١١ی شــەوی ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٥ لــە ڕێکخــراوی ئاسودە ژنێك درایە بەر دەستڕێژی گوللە و بەسەختی بریندار کرا[٦٠].

لەبەرنامەیەکی ڕادیۆی نەوا دا کە مێوانداری خاتوو (چلورە) کرابوو، خاوەنی سەنتەی (خاتوو زین)[٦١] ئافرەتێك پەیوەندی کرد گوتی: ڕێکخراوەکان هیچ پشتگیریەك لە ئافرەت ناکەن، من خۆم هاوڕێیەکم هەبووە، - دوای ئەوەی لە ماڵەوە هەڵدێت- دەچێتە ڕێکخراوەکانی ژنان مانگێك لەوێ دەمێنێتەوە، دواتر ڕەوانی ماڵەوەیان کردۆتەوە، پاشان ئافرەتەکەیان کوشتووە، کەچی ڕێکخراوەکان هیچ لێیان نەپرسیوەتەوە، ئایا ماوە

---

(٥٩) ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی (WOLA) سایتی: www.kurdistanonline.net

(٦٠) ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی (WOLA) سایتی: www.kurdistanonline.net

(٦١) سەنتەی خاتوو زین لە ساڵی ٢٠٠٠/٥/٢٧ بە ڕەسمی کراوەتەوە.

نەماوە؟! من نازانم باشە ئەمانە خەریکی چین؟! تەنها مەعاش وەرگرتن و گیرفان پڕکردنە هیچی تر..[٦٢]!!

لە ڕۆژنامەی ڕێوان لە ژمارە ٢٠٤دا بلاوکراوەتەوە کە تێیدا باسی کوشتنی کچێك و زیندەبەچاڵکردنی دەکات لەلایەن باوکیەوە، ئەم کچە لە هەردوو شێڵتەری بەڕێوبەرایەتی بەدواداچوونی توندوتیژی و دواتر لە ڕێکخراوی ئاسودە داڵدەدراوە[٦٣].

بەڕێزان سەیرکەن دەبینین کوشتنەکان دوای هەڵاتنی ئافرەتەکان دەسپێدەکات کە بە دۆڵی داکۆکی کارانی مافی ئافرەت هەڵدێن ئینجا تووشی کوشتن ئەبن.

---

(٦٢) بەرنامەیەکی ڕادیۆی نەوا کە مێوانداری خاتوو (چلورە)ی کردبوو، خاوەنی سەنتەی (خاتوو زین)، لە بەرواری ٢٠٠٨/٢/١ سەعات (٤)ی ئێوارە.

(٦٣) ڕاپۆرتەکەی ڕێخراوی (WOLA) سایتی،www.kurdistanonline.net

# پێشێل کردنی مافی ئافرەت و چەوسانەوەی

بەم دواییە یەکێتی زانایان داوایان لە وەزارەتی تەندرووستی کرد کە لە نەخۆشخانەی لە دایک بوون و منداڵان پزیشکی پیاو نەمینێت ئافرەت دابنرێ، وەزارەتی تەندرووستیش رەزامەندی لەسەر داواکاریەکە نیشاندا، بەڵام یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بە توندی نارەزاییان دەربری لەو بارەیەوە نووسراویان بەرز کردوە کە دەبێت هەر پیاو بمینێتەوە[٦٤].

ئایا ئەوە ئارەزووی خۆیانە بۆ پیاو یان ئارەزووی هەموو ئافرەتانی کوردستان؟ ئایا ئەوە ستەم نیە بەرانبەر ئافرەت؟ با راپرسیەك بکەن بزانن چەند ئافرەت بەو بڕیارەی ئەوان رازین؟!

یان پرۆژە یاسایەکیان دایە پەرلەمان هەر ئافرەتێك سەر بەهەوێ شوو بکات غەرامە بکرێ.. ئایا ئەوە پێشێل کاری نیە بەرانبەر ئافرەت، ئەگەر ئافرەتێك بە ئازادی خۆی بەوە رازی بێت پێشێلکاری نیە رێگای لێ بگیرێت؟!

(٦٤) رۆژنامەی میدیا (ژ:٣٢٢/ ل: ٢)ی ساڵی ٢٠٠٨/١/١٥.

# دژایەتی کردنی ئیسلام

ئەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن، ئامانجی سەرەکیان دژایەتی کردنی ئیسلام و ناشیرین کردن و لە ناو بردنی بەها بەرزەکانی ئیسلامە.. بۆیە دەبینین لە هەموو وتار و نووسینەکانیان هێرش دەکەنە سەر ئیسلام و مامۆستایانی ئایینی، چ قسەی ناشیرین هەیە بە ئیسلام و بە موسڵمانان دەڵێن، لە کاتێکدا جنێودان و قسە وتن بە دین لێپرسینەوەی یاسایی لەسەرە و سزای یاسایی لەسەرە لە هەموو یاساکانی جیهاندا..

## سزای یاسایی سووکایەتی کردن بە ئاین:

مادەی (٣٧٢)ی (قانون العقوبات العراقی) ژمارە (١١١)ی ساڵی (١٩٦٩)ـە کە ئێستا لە عێراق و هەرێمی کوردستان کاری پێ دەکرێ:

### الجرائم التی تمس الشعور الدینی
### ئەو تاوانانەی دەرحەق بە ئایین دەکرێ

الاول: یعاقب بالحبس مدة لاتزید علی ثلاث سنوات أو بغرامة...
واتە: سزادەدرێ بە زیندانی لە سێ ساڵ زیاتر نەبێ یان غرامە دەکرێ بە...

أ- من اعتدی باحدی طرق العلانیة علی معتقد لاحدی الطوائف الدینیة او حقر من شعائرها.
واتە: هەر کەسێك بە ئاشکرا سووکایەتی بکات بە بیروباوەری گرۆهێکی ئاینی یان سووکایەتی بکات بە دروشمێکی دینی.

ب- من تعمد التشويش على اقامة شعائر طائفة دينية او على حفل او اجتماع ديني او تعمد منع او تعطيل اقامة شئ من ذلك.

واتە: هەر کەسێك بە ئەنقەست دروشمێکی دینی بشێوێنێ یان ئاهەنگێکی دینی یان کۆبوونەوەیەکی دینی یان ڕێگر بێت لە ئەنجامدانی ئەو دروشمانە.

ج- من خرب او اتلف او شوه او دنس بناء معد لاقامة شعائر طائفة دينية او رمز او شيئا اخر له حرمة دينية.

واتە: هەر کەسێك شوێنی ئەنجامدانی دروشمی ئایینی یان هەر شتێکی تر پیرۆزی دینی بڕوخێنێ یان لەناوی بەرێت یان بیشێوێنێت یان پیسی بکات،

د- من طبع او نشر كتابا مقدسا عند طائفة دينية اذا حرف نصه عمدا تحريفا يغير من معناه او اذا استخف بحكم من احكامه او شي من تعليماته.

واتە: هەر کەسێك کتێبێکی پیرۆزی ئایینی ناوەڕۆکی بگۆڕێ کە واتاکەی تێك بدات یان سووکایەتی بە حوکم و ڕێنموویەکانی بکات وبە کەمی بزانێ.

هـ - من اهان علنا رمزا او شخصا هو موضع تقديس او تمجيد او احترام لدى طائفة دينية.

واتە: هەر كەسێك بە ئاشكرا سووكایەتی بە هێمایەك یان كەسێكی ئایینی بكات كە بە رێزە و بە پیرۆز ئەزانرێ لای ئایین پەروەرانی.

و- من قلد علنا نسكا او حفلا دينيا بقصد السخرية منه.

واتە: هەر كەسێك بە گاڵتە جاریەوە دروشمێكی ئاینی ئەنجام بدات.

الثاني: يعاقب بالحبس مدة لاتقل عن سنة ولاتزيد على ثلاث سنوات أو بغرامة...

واتە: سزادەدرێ بە زیندانی لە ساڵێك كەمتر نەبێت و لە سێ ساڵیش زیاتر نەبێ یان غرامە دەكرێ بە...

كل من تعرض باحدى طرق العلانية للفظ الجلالة سبا او قذفا باية صيغة كانت

واتە: هەر كەسێك بە هەر رێگایەكی ئاشكرا بێت سووكایەتی و جنێو بە (لفظ الجلالة) بدا، واتە: خوا.

خوێنەری بەڕێز من هیچ ناڵێم تەنها خۆت حوکم بدە بزانە ئەوانەی خوارەوە گاڵتە و جنێو سوکایەتی نیە بە دینمان.. بزانە ئەو یاسایەی سەرەوە دەیانگرێتەوە..

ئەم وێنەی خوارەوە لە ساڵنامەی (٨مارس) بڵاوکراوەتەوە، کە یەکێتی ژنانی کوردستان دەریدەکات، لەم وێنە کاریکاتێریە دەبینین ژنێك عەبایەکی لەسەرە و پێچەی بە ڕوخساریەوەیە و پەنجەوانەی لە دەستە، عەبایەکەی دوو قوفڵی پێوەیە..

پیاوێکیش وەکوو شەیتان و ئاژەڵی دڕندە دوو قۆچی هەیە و کەمێك ڕیشی هەیە و پۆشاکێکی کوردی لەبەردایە، کلیلێکی بە دەستەوەیە کە عەبایەکەی پێ قوفڵ داوە.. واتە: پیاوی کوردی موسڵمان ئاوایە بەرانبەر بە ژن.




(٦٥) ٨ مارس ژمارەی (٥)ی ساڵی ٢٠٠٤/٣/٨.

**خاتوو شاناز بەرزنجی دەڵێت:** لەو ڕۆژەوە ئیسلام پێی نایە کوردستان هەر بەشی ژنانی کورد بەش مەینەتیی و کوێرەوەرییە، قورئان ئەو کتێبەیە کەپڕە لە بەدڕەوشتیی بەرامبەر ئافرەتان و پیاوان هاندەدا بۆ فرەژنیی و لێدانی ژنان و پێشێلکردنی مافەکانیان و بە ڕەوا زانینی کوشتنیان و بەردەبارانکردن و هەموو ناشیرینیەکانی تر(٦٦).

**خاتوو تاڵگە سایر دەڵێت:** ئیسلام هات و بەسەپاندنی فکر و یاسایە جەنگەلستانیەکەی دورگەی عەرەب هەموو بەها جوان و داب ونەریتە ڕەسەنە جوانەکانی کوردی خنکاند! ئیسلام هات و ژنی کردە پلە دوو و فرەژنی و چەوسانەوەی ژنی سەپاند! لە شکری داگیرکەری ئیسلام هات و بە زەبری شمشێر و لافاوی خوێن هەموو یاسا و شەرعە دواکەتوو و دژە ئینسانیەکانی سەپاند کە زۆرینەی دژی ژنە(٦٧).

**خاتوو هۆزان محمود** کە ڕێخەری کەمپینی نێونەتەوەییە بۆ لابردنی مادەی (٦) لە دەستووری هەرێمی کوردستان، ئەو نەك

---

(٦٦) سایتی: http://www.emrro.com/estaykicani.htm

(٦٧) سایتی: http://www.emrro.com/pkurdistan.htm

تەنها ئیسلامی پێ خراپە، بەڵکو هەموو ئاینە ئاسمانیەکانی پێ خراپە، بەوە لە قەڵەمی دەدات کە هەموو ئاینەکان دژی ژنانن و ئازادی مرۆۃ پێشێل دەکەن و ناهێلێن بە مافەکانی بگات دەڵێت:

مەسەلە بەس تەنها لەگەڵ ئیسلام نییە، من پێم وایە هەموو ئاینەکان دژی ژنان، دژی ئازادی ئینسانەکان و هی ئەم سەردەمە نین بۆیە ناگونجێن لەگەڵ عەقلییەتی پێشکەوتنخوازی ئەم سەردەمە و دەستکەوتەکانی بەشەرییەت، هەر بۆیە ئیسلام و شەریعەتەکەی نابێت بەشێك بێت لە دەسەڵات و دەستوور، هێشتنەوەی بەندی حەوت[٦٨] یاری کردنە بە چارەنووسی خەڵکی کوردستان و ماف وئازادی

---

(٦٨) ئەو کەمپینە لە چەند کەسێك پێك هاتووە کە هەموو هەوڵیان بریتیە بۆ ئەوەی ئیسلام دوور بخەنەوە لە ژیانی خەڵکی، بۆیە دژایەتی مادەی (٦) دەکەن لە یاسای هەرێم، چونکە یاساکە دەڵێت: بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام یەکێکن لە سەرچاوە سەرەکیەکانی یاسادانان، ئەمەش دەقی مادەی (٦)ـە لە یاسای هەرێم "ئەم دەستوورە جەخت لەسەر ناسنامەی موسلمانێتی زۆرینەی گەلی کوردستان دەکات و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام یەکێکن لە سەرچاوە سەرەکیەکانی یاسادانان، هەروەها تەواوی مافە ئاینیەکانی مەسیحی وئێزیدی و هی دیکە لە ئازادی باوەڕ وپیادە کردنی ئایین دەستەبەردەکات" دەستووری هەرێمی کوردستان.

ئینسانەکان ئەسپێرن بە ئاین، بە ڕای من ئەمە فاشییەت درووست دەکات[٦٩].

د. نەزەند بەگیخانی: کە چالاکە لە بواری ئافرەتان دەڵێت: ئایین پاڵپشتیی لە ملکەچیو ژێردەستەییو بێ مافی ژن دەکات، هەرسێ ئایینەکە (یەهودی، مەسیحیەت، ئیسلام) ستروکتورێکی پتەوی پیاوسالارییان هەیە، هەمویان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی جەستە و سێکچوالێتیی ژنیان داوە، جیاوازیی ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی دیکە، ئەوەیە دەست دەخاتە ناو وردەکارییەکانی ڕۆژانەی خەڵك و کۆمەڵگەوە، ئایین ڕۆڵی زۆرە لەو پێشێلکاریانەی لە کۆمەڵگەدا بەرامبەر بە ئافرەت دەکرێت... ئایین بۆتە هۆکاری سەرەکیی بۆ پێشێلکردنی ماف و ئازادی، دیارە لە ڕووی مێژوییەوە هەموو ئایینەکان ئەو ڕۆڵەیان بینیوە..

پاشان دەڵێت: -دەبینین- لە یاسای باری کەسێتیدا ئەو هۆشیارییە بەدی نەکرا، من یەکێك بوم لەو کەسانەی لەو خۆپیشاندانانەی کە چەند ڕێکخراوێکی ئافرەتان بۆ بەردەم

---

(٦٩) http://www.equalityiniraq.com/ka/index.php?option=com_content&view=article&id=٧٧:٢٠٠٨-٠٩-٢٢-٢٢-٥٨-٠٩&catid=٣٥:articles&Itemid=٦٦

پەرلەمانی کوردستان سازیان کردبو، بۆ پشتگیریکردنی ریفۆرمی یاسای باری کەسێتی، ئەوانەی لەوێبوین چەند کەسێکی کەم بوین، دواتریش کە یاسای فرەژنی پەسەندکرا، کەس ئامادەنەبوو بێتە سەر شەقامو ناڕەزایی لەدژی بڕیارەکەی پەرلەمان دەرببڕێت، ئەمە زۆر لێکدانەوە هەڵدەگرێت، لە سەروی هەموویەوە لاوازیی هۆشیاریی تاك لەمەڕ مافە مەدەنییەکانیان دەردەخات، کەچی سەیردەکەیت لەسەر کاریکاتۆرێکی دانیمارکی کە لەسەر کەسایەتیی پێغەمبەر کرابو، نیوەی خەڵکی هەولێر رژانە سەر شەقام بۆ خۆپیشاندان لەدژی ئەو وێنانە کە هیچ پەیوەندیان بە ژیانی رۆژانەی ئێمەوە نییە [٧٠].

خاتوو کەژاڵ حەمە ڕەشید دەڵێت: دینی ئیسلام و پەیرەویکردنی یاساکانی ئیسلام گەورەترین پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤە و بە تایبەتی ژنان، بۆیە دەبێت بڕیار لەسەر جیاکردنەوەی دین لە دام و دەزگاکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بدەین و کاریان بۆ بکرێت [٧١].

---

(٧٠) دیمانەکە ڕۆژمانەی ڕۆژنامە لەگەڵی سازی دابوو، سایتی سبەیش لەوێی وەرگرتووە، /http://www.sbeiy.com

(٧١) گفتوگۆی سایتی هاوپشتی لەگەڵ " کەژاڵ حەمە ڕەشید" سەبارەت بەیاسای باری کەسێتی و پەسندکردنی فرەژنی لەلایەن پەرلەمانی کوردستان"

خاتوو هاوژین حەمە ڕەشید، بێ ڕێزی بەرامبەر هەموو پێغەمبەرانی خوا دەکات و بەوە ناویان دەبا کە هەر یەکەو چەند ئافرەتێکیان لە ژوورەوە کردووە و کاری (؟؟؟) کە دەڵێت:

"سێکسی بە کۆمەڵ ئەو پرۆسە سێکسییەیە کە دوو کەس زیاتر لە کردەی سێکسیدا بەشدار دەبن.... جا گرنگ نییە چەند ژنن یاخود چەند پیاون.. ئەم پرۆسەیە لە کۆمەڵگە ئازادەکاندا بە ئاشکرا و لە زۆر باردا بە فەرمی و یاسایی ڕێی پێدراوە... بەڵام لە کۆمەڵگە داخراو و نەریتی و ئاینییەکانیشدا بە جۆرێکی دیکە و لە ژێر ناوی فرە ژنی ڕەوایەتی دراوە بە سێکسی بە کۆمەڵ... کە پیاوی خاوەن دوو ژن لە ژوورێك و بەرهەیوانێکدا دەژیت و لە نێوان هەردوو ژنەکەی لە سەر یەك جێ سێکس دەکات... ئەمە جگە لە ژنەکانی پەیامبەرە ئاینییەکانیش حەزرەتی ئیبراهیم و یەعقوب و یوسف و داود هەریەکە و دووژنیان هەبووە و پێغەمبەری موسڵمانانیش لە کاتی وەفاتیدا یازدە ژنی هەبووە و لای ماونەتەوە... لەو سەردەمەشدا لە کوخێکی قوریندا کە زۆر جار تەنیا ژوورێك بووە و یەك سەرجێیان هەبووە و لە یەك کاتدا پیاوەکە لە نێوان دوو یان سێ ژندا کردەی سێکسی ئەنجامداوە"[٧٢].

(٧٢) ڕۆژنامەی ڕووداو:www.rudaw.net فیمینیستەکانی ئێمە و سێکسی بە کۆمەڵ.

**دیارە ئەو ئافرەتە ئاستی ڕۆشنبیری زۆر نزمە لەبەر ئەوەی:**

یەکەم: هیچ شارەزایی لە مێژوو نیە و وا ئەزانێ ئەوەی ١٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا ژیابێت ئەوە لە کوخ ژیاوە و تەنها کوخ هەبووە و هیچی تر، لە کاتێکا دەبینین ئەو بینا و معماریەی ئەو کاتی هەبوو هی سەردەمی خۆمان سەری لێ دەرناکەن..

دووەم: هیچ شارەزایی لە دین نیە وقسەی تیا دەکات، کە دەڵێت: پێغەمبەری ئیسلام هەموو ژنەکانی لە ژوورێك کردووە و لە یەك جێگا.. ئەوەی بزانێ قیبلە ڕووی لە کوێیە ئەزانێ ئەو کارە لە ئیسلامدا حەرامە.. پێغەمبەریش (صلی) بۆ هەر خێزانێکی خانوویەکی ئامادەکردووە، ئەوە مێژوو نووسیویەتییەوە و شوێنەوارەکەی دیارە.. ئەمەش وێنەی ژووری خێزانەکانی پێغەمبەرە (صلی).



**خاتوو گوڵاڵە پشدەری** دەڵێت: ئەگەر یاسا لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام بێت، ئەوە لەگەڵ خواستەکان و ئارەزووەکانی نەوەی نوێ ناگونجێت و ناکۆکی لە نێوان دەسەڵات و گەل دروست دەکات... بە بۆچوونی من یاسا و ئایین لە یەکتر دوور بکرێنەوە گرفت و ئاریشەکانی کۆمەڵگا کەمتر دەکاتەوە[٧٣].

**خاتوو فائزە جلال** دەڵێت: ئاین خراپترین گواستنەوەیە لە جیاوازی بایۆلۆژییەکان بۆ دنیایەکی بێ ماف و سەرکووتگەر و لە قاڵبدراوی کۆمەڵایەتی بۆ ژنان، کە کاریگەری و قورسای گەورەی لە سەر کەلتور و یاسا و خێزانیش داناوە، ئایین ئەوندە مێشکی مرۆڤی بچووك کردۆتەوە، کە بڕوای بە وەهم و بۆچوونی ناواقعی بەرامبەر بەرەگەزی مێ هەبێت و تا دەگاتە ئەو ڕادەی ژنان ناسنامەی خۆیان وون بکەن، ئەفسانەی ئاینی وایکردوە، مرۆڤ لە ئاست ڕاستییەکانی ژیانکردن کوێر و نادیدە بێت، ئاین پێمان دەڵێت جەستەی ژن بەشێکە لە موڵکی پیاو و دەتوانێت وەك کێڵگەکانی ئازادانە بیکێڵێت، هەر وەك

---

(٧٣) ڕۆژنامەی کوردستان ڕاپۆرت (ژ:٤١٥/ ل: ٨).

لەم ئایەتە هاتووە "نسائکم حرث لکم فاحرثهن کما تشائون"[(٧٤)] ئاین لەدەمی پەیامبەرەکانییەوە پێمان دەڵێت "انما النساء ناقصات العقل والدین" تەنانەت لە هەموو ئایینە یەکتاپەرستەکاندا ژنان شەرەفی پەیامبەرییان پێنەبەخشراوە و لە ئایینی ئیسلامدا ژن بۆی نییە لە مینبەری مزگەوتەکانەوە بانگی نوێژ بدات[(٧٥)].

(٧٤) ئەوی ئەو خاتوونە بە ئایەت ناوی دەبات لە قورئانی موسڵماناندا نیە وئایەت نیە، نازانم ئەو لەسەر چ ئاینێکە ڕەنگە لە ئاینەکەی ئەودا ئایەتێکی ئاوا هەبێت، بە داخەوە لەسەردەمی تەکنەلۆژیادا کە تەنها بە ووشەیەك لە ئەنتەرنێت چیت ویست دەیدۆزیەوە کەچی نەزانی ئایەتێك چۆن دەنووسرێ.

(٧٥) http://kurdpost.org/details.aspx?Jimare=١٢&Besh=Birwra

## دژایەتی کردنی مامۆستایانی ئایینی وشێخەکان

سزای یاسایی سووکایەتی کردن بە کەسێکی پیرۆزی ئایینی مادەی (۳۷۲)ی (قانون العقوبات العراقی) ژمارە (۱۱۱)ی ساڵی (۱۹٦۹)ـە کە ئێستا لە عێراق و هەرێمی کوردستان کاری پێ دەکرێ:

یعاقب بالحبس مدة لاتزید علی ثلاث سنوات أو بغرامة...

واتە: سزادەدرێ بە زیندانی لە سێ ساڵ زیاتر نەبێ یان غرامە دەکرێ بە...

من اهان علنا رمزا او شخصا هو موضع تقدیس او تمجید او احترام لدی طائفة دینیة.

واتە: هەر کەسێك بە ئاشکرا سووکایەتی بە هێمایەك یان کەسێکی ئاینی بکات کە بەڕێزە و بە پیرۆز ئەزانرێ لای ئایین پەروەرانی.

خاتوو نیان عمر دەڵێت: زۆربەی مامۆستایانی ئایینی ئێمە خێزانیان تێك هەڵوەشاندووە، قوڕیان کردووە بەسەری خەڵکی، ئەزانی ئافرەتانی ئێمە چەنێ تووشی نەخۆشی نەفسی بوون – بەدەستی مامۆستایانی ئایینی– من قسەم لەسەر ئەوەیە تەلأقم کەوت تەلأقم نەکەوت.. ئیتر ئافرەتی ئێمە دایم لە لای شێخ و مەشایخ و مەلاوەیە، ئەو مەلایە دەڵێ کەوت ئەو مەلایە دەڵێ نەکەوت، بۆیە من زۆرجار دەڵێم: چۆنە بڕۆی لەگەڵیا، تەلأقەکە کەوتبێ نەکەوتبێت بژی لەگەڵ ئەوکەسەیا[٧٦].

خاتوو شاناز بەرزنجی دەڵێت: مەلا و پیاوە ئایینییەکانی کوردیش ڕۆڵیان لەم گۆڕانکاریە نێگەتیفەدا بینی و سەدان هەنگاو ژیانی ئاسایی کوردیان شێواند و ئەو کەشە جوانەی هەڵبژاردنی نێر و مێ بۆ یەکتریان بە بەدڕەوشتی دایە قەڵەم و لەجێیدا کولتووری ناشیرینی فرەژنیی و کڕین و فرۆشتنی ئافرەتان بەناوی مارەیی و ئەو چەشنە نەریت و شتە بێ واتایانەیان هێنایە ناوەوە، ئیتر شێخ و مەلا و پیاوانی ئاینی ئیسلامی کورد ئەو ئاینەی ئیسلامیان بەکارهێنا بۆ بەجێهێنانی مەرامەکانیان جوانترین کچ هەر لە مەلا و شێخ و

(٧٦) ڕادیۆی جەماوەر بەرواری (٢٠٠٨/٣/٨) کاتژمێر (٠١:٥٨)ی نیوارە.

پیاوە ئاینیی و سەرۆك خێڵ و ئاغا و داروودەستەکانیان مارە دەکران...

هەر ئیسلام لە بنەڕەتەوە بیرۆکە و تێزێکی تیرۆریست و مرۆڤ کوژە کە ئەمڕۆ بەپشتگیریی هەردوو حیزبە گەندەڵەکەی کوردستان تا دێت بەرەوپێش دەچن، لە جێی دروستکردنی شوێنە گشتییەکان و خزمەتکردنی خەڵك و جوانکردنی شارەکان و بە شارستانی کردنی کوردستان، تا دێت هەردوو حزبەکە زیاتر هاریکاریی مەلا و پیاوە ئایینییە بێکارە گەندەڵەکان دەکەن و لە کویێ بیانەوێ مزگەوتیان بۆ دروست دەکەن و تاد(٧٧).

خاتوو سەرگوڵ ئەحمەد دەڵێت: حوکومەتی هەرێمی کوردستانیش لە کاتیکدا دەیانەوێت یاسایەکی کۆنەپەرست لە کوردستاندا جێگیر بکەن... دەیان دەزگا و ڕێکخراوی کۆنەپەرستی وەك وەزارەتی ئەوقاف... هتد، دامەزراندووە(٧٨).

---

(٧٧) سایتی، http://www.emrro.com/estaykicani.htm

(٧٨) http://www.hawpshti.com/ku/index.php?option=com_content&task=view&id=٢١٦١&Itemid=٢٦

د. نەزەند بەگیخانی دەڵێت: لە بارودۆخێكی ئاوادا و كاتێ كۆمەڵگە بە هێزی غەریزە ڕەفتار دەكات و دەسەڵاتی سیاسیش ستراتیژیەت و پرۆگرامی پێویست و گونجاوی نیە بۆ ئاراستەكردن و چاككردنی ئەو بارودۆخە، ئەوە مزگەوت دەبێتە هێزی زاڵ و رابەری كۆمەڵگە، مزگەوتیش لە ڕێگای سەركوتكردن و ڕیسواكردنی ئازادی بە ناوی بەڕەڵلایی و بەدرەفتاری و بەدرەوشتیەوە خەڵك چەواشە دەكات و كۆمەڵ بەرەو دواكەوتوویی و نابەخشندەیی و توندڕەوی رادەدات.

هەستكردن بە گوناهیش كە مەلاكان لە ڕێگای گوتارە نەشاز و پڕ لە نەزانیەكانیان برەوی پێدەدەن، كچ و كوڕێكی زۆر بەرەو نەخۆشیی دەروونی وەكو خۆخواردنەوە و خەمۆكی تا ئاستی خۆكوشتن دەبات(٧٩).

***********************************

(٧٩) ڕۆژنامەی هاوڵاتی http://٨٢,١٦٩,١٢,٢٠٢/K_Direje.aspx?Jimare=١١&Besh=Aburi&Cor=٧.

**لە کۆتاییدا:** خۆشحاڵ دەبم ئەگەر پێشنیار و تێبینی و ڕەخنەکانتانم پێ بگات لە بارەی ئەو کتێبەوە یان کتێبەکانی دیکەم، بەو ناونیشانە:

فەرمان خەرابەیی/ پێش نوێژ و ووتارخوێن/ مزگەوتی ماجیداوە/ هەولێر

**پێگەی ئەنتەرنێت:** www.m-farman.com

**ژمارەی مۆبایل:** ٠٧٥٠ ٤٦٣ ٢٠ ٥٣

## ناوەڕۆک........................ لاپەڕە

### بەشـی یەکەم



### بەشـی دووەم



### ئامانج و پیلانەکانیان

## بەرهەمە چاپکراوەکانی تری نووسەر:

١. ناوە جوانەکانی خوای گەورە.. بە بەڵگەی قورئان وسوننەت.
٢. هۆکارە بەسوودەکان بۆ ژیانێکی ئاسوودە.
٣. زایەڵـــەی شـــادی.
٤. لاوان کاتی نەهاتووە بگەڕێینەوە؟!
٥. کێ دەکەی بە هاوسەری ژیانت؟
٦. ئاوێتەی دڵ/ الفوائد.
٧. خۆشـــەویستی، خوێندنەوەیەکی شەرعیانە و سەردەمیانەوە.
٨. ڕێبەری نوێژەکان.
٩. تەمەنی زێرین.. بە فیرۆی نەدەین.
١٠. ڕاستییەکی وونبوو! ئەم کتێبەی بەر دەستتە.

## زنجیرە چیرۆکی ڕاستەقینە پێك هاتووە لە (١٠) چیرۆك:

١. کاسێتێکی ڤیدیۆ ژیانی لێ تاڵ کردم.
٢. کەنجێـــــک ئابڕووی پاراستم.
٣. ڕۆڵـــــــە شیرینـــەکەم.
٤. ســـارا دوای (٢٢) ساڵ لە گوناه و تاوان.
٥. خۆی و خێـــزانی دۆڕانـــد!!
٦. چی بچێنی ئەو دە دووریـــەوە.
٧. سێ کورتە چـــــــیرۆک.
٨. مۆبایل ژیانی لێ تاڵ کـــــردم.
٩. خوشـــــکم بۆ ئابڕووت بردم!!
١٠. داب و نەریت بەرەو گۆڕیی بردم.

